# The Profession of Veterinary Medicine : A Brief History

# مێژووی پیشەی پزیشکیی ڤێترینەری

## ( کورتە باسێکی مێژووییە )

دکتۆر فەرەیدون عەبدولستار
کۆلێجی پزیشکیی ڤێترینەری ـ زانکۆی سلێمانی
سەندیکای پزیشکانی ڤێترینەری کوردستان ـ سلێمانی

چاپی یەکەم
٢٠٢٠

بەناوی خوای گەورە و میهرەبان

## پێناسی کتێب

ناوی کتێب: مێژووی پیشەی پزیشکیی ڤێترینەری.

نوسەر: دکتۆر فەرمیدون عەبدولستار.

تایپ: کۆمپیوتەری بانوو.

دیزاین: علی دیزان ـ ڤاری .

چاپخانە : پیرەمێرد .

تیراژ: ٥٠٠ دانە.

ژمارەی سپاردن: لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان ژمارە (١٨٢٩) ی ساڵی (٢٠٢٠)ی پێدراوە.

## پێرست

## ئەم بەرهەمە پێشکەشە بە . . . .

- ڕۆحی پاکی برای جوانەمەرگم ئەندازیار ( چیا عبدالستار ) کە لە ڕۆژی ٢٠٢٠/٦/١٩ لە شاخی گۆیژە لەکاتی وەرزشکردندا کۆچی دوایی کرد لە شاری سلێمانی .
- ڕۆحی پاکی (د.هیوا تۆفیق) پزیشکی ڤێترینەری لە بەڕێوەبەرایەتی ڤێترینەری شاری هەولێر لە ڕۆژی ٢٠٢٠/٧/١٥ کە بە نەخۆشی ڤایرەسی کۆرۆنا کۆچی دوایی کرد.
- ڕۆحی پاکی هونەرمەندی گەورەی گەلەکەمان (سابیر کوردستانی) کە لە ڕۆژی ٢٠٢٠/٨/١٠ بەهۆی نەخۆشی ڤایرەسی کۆرۆنا کۆچی دوایی کرد .

# سوپاس و پێزانین

سوپاس و پێزانینمان هەیە بۆ . . . .

- بەڕێز دکتۆر ( عەباس عەلی عەبدی / سەرۆکی سەندیکای پزیشیکانی ڤێترینەری کوردستان / سلێمانی ، کە کۆمەڵێك زانیاریَ گرنگ و سەرچاوەی مێژوویی پێشکەشکردین کە بووە هۆی دەوڵەمەندکردنی پەرتوکەکە.

- بەڕێز (د.نازەنین عثمان حسن / مامۆستا لە کۆلێژی پزیشیکی ڤێترینەری زانکۆی سلێمانی کە کاری پێداچونەوەی پەرتوکەکەی گرتە ئەستۆو لە ئەنجامدا کۆمەڵێك تێبینی زمانەوانی و زانستی گرنگی خستەڕوو کە بووە هۆی دەوڵەمەندکردنی ناوەرۆکی بابەتەکە .

**پێشەکی :**

لە مێژەوە ئارەزووی ئەوەم دەکرد کە دەرفەتێك بێتە پێشەوە بۆ نوسینی پەرتوکێك سەبارەت بە گێڕانەوەی چیرۆکی مێژووی پیشەی پزیشکیی ڤێترینەری لە سەردەمە کۆنەکانەوە تا سەردەمی نوێ ، ئەو دەرفەتەش ڕەخسا کاتێك لە ماڵەکانماندا ماینەوە بۆ ماوەی دوو مانگێك لە چوارچێوەی پابەندبوون بە ڕێنماییە تەندروستیەکان و خۆپارێزی لە کاتی بڵاوبونەوەی پەتای ڤایرەسی کۆرۆنا لە گشت وڵاتانی جیهان.

لەو ماوەیەدا شەوم دەخستە سەر ڕۆژ بە مەبەستی کۆکردنەوەی کۆمەڵێك زانیاری مێژوویی بێ گومان پشتبەستن بە ژمارەیەك لە سەرچاوەکان.

ئەم پەرتوکە کۆمەڵێك زانیاری مێژوویی لەخۆدەگرێت هەر لە سەردەمەکانی کۆنی پێش زایینەوە تا سەردەمەکانی دوای زایین قۆناغ لە دوای قۆناغ هەتاکو دەگەینە سەردەمی ڕاپەڕینە مێژووییەکەی ١٩٩١ی باشوری کوردستان و لە ئەنجامدا دامەزراندنی کۆلێجەکانی پزیشکیی ڤێترینەری.

وەکو دەرەنجامێك دوای خوێندنەوەمان بۆ مێژووی پیشەی پزیشکیی ڤێترینەری لە قۆناغە جیاجیاکانی مێژووداو پشتبەستن بە سەرچاوەکانی مێژووی کۆن و نوێ بۆمان دەردەکەوێت :

یەکەم : بیرۆکەی ((یەك تەندروستی و یەك پزیشکیی)) بە درێژایی قۆناغە مێژووییەکان ئەو بنەما فەلسەفییە بووە کە پزیشکان کاریان لەسەر کردووەو ئەتوانین بڵێین کە زانستەکانی پزیشکیی ڤێترینەری

و پزیشـــکیی مرۆڤـــ تەواوکـــەری یـــەکتربوون بـــەوەی خوێنـــدن و لێکۆڵینـــەوە لـــە بابەتـــەکانی پزیشـــکیی ڤێترینـــەری هۆکـــارێکی بـــاش بووە بۆ تێگەیشتن لە بابەتەکانی پزیشکیی مرۆڤـ ، لەبەر ئەوەیە کە دەڵێین تا تەندروستی ئاژەڵ و باڵندەکان پارێزراو نەبن بێ گومان تەندروستی مرۆڤیش پارێزراو نابێت.

لە ڕۆژی جیهانی پزیشکیی ڤێترینەری لە ڕێکەوتی ٢٠١٦/٤/٣٠ یەکـەمین کـۆنفرانس لـە ژێـر دروشـمـی ( یـەك تەندروسـتی – یـەك پزیشـکیی – یـەك کوردسـتان ) سـازکرا لەلایـەن هـەردوو کـۆلێجی پزیشکیی و پزیشکیی ڤێترینـەری لـە زانکۆی سلێمانی کە پەیامی کۆنفرانسەکە بریتیبوو لەوەی کە پەیوەندیەکی گرنگ هەیە لەنێوان تەندروستی مرۆڤـ و تەندروستی ئاژەڵـەکان و کاریگەریـەکی زۆریـان لەسـەر یـەکتری هەیـە و پێویسـتە کـاری هاوبـەش ئـەنجام بدرێـت بـە مەبەستی پاراستنی تەندروستی هەردوولا.

دووەم : مێژوونوسان ، نوسراوەکانی کاهون (Kahun papyrus) بە یەکەمین و کۆنترین بەڵگەی نوسـراو دادەنێن لـە مێـژوودا کـە داتـای تێـدا تۆمـارکراوە لـە بـارەی کێشـەکانی پزیشـکیی ڤێترینـەری لـە سەردەمی میسری کۆن.

سێ یەم : ئەسپ لەو گیانلەبەرانەیە کە پێگەیـەکی بـالای هـەبووە لـە مێـژووی مرۆڤایـەتی و ژیـانی کۆمەڵگەکانـداو لـە ئەنجامـدا ڕۆڵـی لەبەرچـاوی هـەبووە لـە دەرکـەوتنی پزیشـکانی ڤێترینـەری لەبـەر ڕاگـرتنی تەندروسـتیان بـە چارەسـەرکردنی نەخۆشـییەکانیان و سارێژکردنی برینەکانیان.

چوارەم : دامەزراندن و کردنەوەی یەکەمین کۆلێجی پزیشکیی ڤێتیرینەری لە شاری لیۆن لە وڵاتی فەرەنسا لە ساڵی (١٧٦١ن لەسەر دەستی زانای سەردەم (Claude Bourgelat) بە دەسکەوتێکی دیاری سەردەمی ڕۆشنگەری دادەنرێت بەوەی زانستەکانی پزیشکیی ڤێتیرینەری و پیشەی پزیشکیی ڤێتیرینەری جێگەی هونەری پزیشکیی ڤێتیرینەری گرتەوە.

پێنجەم : دامەزراندن و کردنەوەی یەکەمین کۆلێجی پزیشکیی ڤێتیرینەری لە زانکۆی سلێمانی لە ساڵی (١٩٩٥ن) لە هەرێمی کوردستان بە دەستکەوتێکی ڕاپەڕینە مێژووییەکەی ساڵی (١٩٩١ن) دادەنرێت و لە دوایشدا لە ساڵی (١٩٩٧ن) کۆلێجی پزیشکیی ڤێتیرینەری لە زانکۆی دهۆك کرایەوەو لە زانکۆی کەرکوك لە (٢٠١٣ن) دامەزرا ، کە بونە هۆی پێگەیاندنی دەستەیەکی ئەکادیمی لە پزیشکانی ڤێتیرینەری خاوەن بڕوانامەی باڵا لە پسپۆریە جیاجیاکانی پزیشکیی ڤێتیرینەری و لە ڕێی توێژینەوە ئەکادیمیەکانەوە کێشەکانی بواری تەندروستی گشتی و تەندروستی ئاژەڵەکان چارەسەر دەکرێن.

لە چوارچێوەی خزمەتگەیاندن بە پیشەی پزیشکیی ڤێتیرینەری لە کوردستان بە پێویستم زانی ئەم زانیاریانە بخەمە بەردەستی ئێوەی خوێنەرو پسپۆڕە بەڕێزەکان ، کاتێ سەیری مێژووی پیشەی پزیشکیی ڤێتیرینەری دەکەین دەمانگەیەنێتە ئەو ئەنجامەی کە فەلسەفەیەك لە پشت پیشەکەوە بووەو تا ئەم سەردەمەش ئاراستەی دەکات و وا پێویست دەکات دەیەها لێکۆڵینەوەو

توێژینەوەی لەسەر بکرێت بۆ ڕووماڵکردنی گشت لایەنەکان، بە تایبەتی مێژووی پیشەکە لە کوردستان کە پەیوەندییەکی قوڵ لە نێوان تاکی کوردو ئاژەڵ و باڵندە کێویەکان و ماڵییەکان و بونەوەرە ئاویەکاندا هەیەو کاریگەریان لەسەر شارستانیەتی ئەم ناوچەیە کە بە یەکێك لە شارستانیەتە مێژووییە گرنگەکان دادەنرێت، بە هیوام ئەم بەرهەمەشمان لە خزمەتی بزوتنەوەی ڕۆشنبیریی گەلەکەماندا بێت و لە کۆتایشدا دەڵێم تکایە بێبەشمان مەکەن لە تێبینیەکانتان.

د. فریدون عەبدولستار

# سەردەمەکانی کۆن

## ( دەورووبەری ٣٠٠٠ - ٢٥٠٠ ساڵ پ.ز )



## - سەردەمەکانی کۆن ( دەورووبەری ٣٠٠٠ - ٢٥٠٠ ساڵ پ.ز )

به پێی سەرچاوە مێژووییەکان، مێژووی کۆنی پیشەی پزیشکیی ڤێترینەری، لە شوێنەوارە کۆنەکان و وێنە هەڵکۆڵراوەکاندا دەردەکەوێت کە مرۆڤ هەر زۆر لە کۆنەوە هۆگری ماڵیکردن و بەخێوکردنی ئاژەڵەکان بووە بە دابین کردنی جێگاو رێگاو خۆراك و پاراستنی تەندروستیان، ئەمەش ئەو راستیە دەسەلمێنێت کە مێژووی پەیوەندی نێوان مرۆڤ و ئاژەڵ زۆر کۆن و دێرینە بەوەی بەڵگەکانی سەردەمی شارستانیەتە کۆنەکانی میسرو چین و هیندو بابلیی و دانیشتوانی سەر زەمینی ماد ئاماژە بەوە دەکەن کە زۆر بایەخیان داوە بە پارێزگاریکردن لە تەندروستی ئاژەڵەکانیان کە ئەم کارەش بێگومان لەلایەن خەڵکی کارامەو شارەزاوە ئەنجام دراوە.

### یەکەم / سەردەمی میسری کۆن :

دانیشتوانی شارەکانی میسری کۆن زۆر گرنگیان داوە بە



ماڵیکردن و بەخێوکردنی گاو مانگاو مەڕو بزن و ئەسپ و ئاسك و سەگ و باڵندەکان ، هەروەها پاراستنی تەندروستیان لە رێی

دەستنیشـــانکردنی نەخۆشـــییەکان و چارەســـەرکردنیان. شـــاری کـاهون (Kahun) یەکێکە لە شارەکانی میسری کۆن کە دەکەوێتە ناوچەیەکی شاری فەیوم لە وڵاتی میسری ئەم سەردەمە. لە ساڵی (١٨٨٩ز) شـوێنەوارناس و میسـری ناسـی بـەناوبانگی بـەریتانی (Flinders Petrie) لە ئەنجامی پشکنینەکانیاندا لە شاری کاهون کۆمـەڵێك بەڵگـەی مێـژوویی نوسـراوی دۆزیـەوە کـە لـە سەرچاوە مێژووییەکانـدا بـە نوسـراوەکانی کـاهون (Kahun Papyrus)[1] ناســراوە (١٩٠٠ پ.ز) و بـەو پێیـە مێژوونوسـان بـە یەکـەمین و کـۆنترین بەڵگـەی نوسـراوی دادەنـێن لـە مێـژوودا کـە زانیـاری پزیشـکیی تێـدا تۆمـارکراوە لـە بـارەی کێشـەکانی پزیشـکیی ڤێترینەری لە وڵاتی میسری کۆن.

بە گـوێرەی نوسـراوەکانی کـاهون گـا و مانگـا لـە ڕووی ئـایینی و ئــــــــابوری و کۆمەڵایەتیـەوە ڕۆڵـی زۆریــان هــەبووە لــە ژیــانی دانیشــتوانی میســـری کۆنـــداو نـــــــاوەڕۆکی



نوسـراوەکانی کـاهون لـە بـارەی پزیشـکیی ڤێترینـەری وە چـەند بڕگەیـەك لـەخۆ دەگرێـت لەوانـەش بڕگـەی یەکـەم بـاس لـە نەخۆشـییەکانی گـا و مانگـا دەکـات لـەو دەمـەداو هـەروەها چارەســەرەکانیش کــە بــەکارهاتوون دەخاتــەڕوو، یــەکێك لــەو

نەخۆشییانەی کە توشی گایەك بووەو تۆمارکراوە پێی ووتراوە نەخۆشی (ushau)[٢] کە لە وەرزی زستاندا بڵاوبووەتەوەو بۆتە هۆی کوێربوونی چاویان و لە دواییدا چارەسەرەکانی ڕوونکردۆتەوە بەوەی پێویستە ئاژەڵە نەخۆشەکە بخرێتە سەر لایەك و ئاوی ساردی پێدا بکرێت. لە بڕگەی دووەمی نوسراوەکانی کاهون دا هاتووە کە میسریەکان زۆر گرنگیان داوە بە لایەنی زاوزێ و زۆربوونی ئاژەڵەکان و چۆنیەتی مامەڵەکردن لەگەڵ کێشەکانیان، زۆر لە وێنە هەڵکۆڵراوەکانی سەر گۆڕەکانیان ئاماژە بەوە دەکەن کە خاوەن ئاژەڵەکان لە ڕێی ڕاکێشانی گوێرەکەکانەوە هاوکاری زاییِنی مانگا ئاوسەکانیان کردووەو پزدانەکانیان لە لەشیان جیاکردۆتەوەو هەندێك جار پشکنینی ناوەوەی لەشی مانگاکانیان کردووەو زۆر بایەخیان داوە بە گوێرەکە تازە لەدایکبووەکان و پەروەردەکردنیان و پاراستنی تەندورستیان، ئەم کارە هونەریانە لە ڕێی خەڵکی کارامەو شارەزاوە جێبەجێکراوەو پێیان گوتون سەرپەرشتیاری ڕەشەوڵاخ.

لە بڕگەیەکی دیکەی نوسراوەکاندا هاتووە هەندێك بابەتی پزیشکیی ڤێترینەری ڕووندەکاتەوە سەبارەت بە چۆنیەتی مامەڵەکردن لەمەڕ نەخۆشییەکانی سەگ و باڵندەکان و ماسی و زۆر گرنگی دەدەنە کێشەو نەخۆشییەکانی چاوی ئاژەڵەکان بە شێوەیەك لە بڕگەیەکدا باسی چاوی سەگێك دەکات کە توشی کرمەکان بووەو لە ئەنجامدا چۆن چارەسەرکراوە بە پێی دیدو بۆچوونی ئەو سەردەمە.

**دووەم / سەردەمی بابلیەکان :**

بە گوێرەی قسەی مێژوونوسان دووەمین و کۆنترین نوسراوی پزیشکیی ڤێتیرینەری لە مێژووی کۆن دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی حوکمی حامورابی ( ١٧٩٥ - ١٧٥٠ پ.ز ) کە شەشەمین پاشای بابلیەکان بووە لە میزۆپۆتامیا .



دەقەکانی پزیشکیی ڤێتیرینەری بەشێکە لە یاساکانی حامورابی کە لە سەرمیلکەی حامورابی تۆمار کراوە( The veterinary text code of Hammurabi) کە لە ڕووی مێژووییەوە بە پلەی دووەم دێت لە دوای نوسراوەکانی کاهون کە بایەخ دەدات بە کێشە تەندروستیەکانی ئاژەڵەکان لەو دەمەدا لە چۆنیەتی چارەسەرکردنی نەخۆشییەکان و پارێزگاریکردن لە مافەکانیان و هەروەها هەقدەستی پزیشکانی ڤێتیرینەری دیاریکردووە.

## سێیەم / سەردەمی هیندی کۆن :

دانیشتوانی هیندی کۆن زۆر بایەخیان داوە بە ماڵیکردن و بەخێوکردنی سەگ و گامێش و فیل و باڵندەکان و بزن و گاو مانگاو ئەسپ کە بەنرخترین سامانی نیشتمانی وڵاتەکەیان زانیوە.

بە پێی نوسراوە مێژووییەکان پزیشکیی ڤێتیرینەری (Shalihotra) بە کۆنترین پزیشک دادەنرێت لە وڵاتی هیندی کۆن کە زۆر بایەخی داوە بە هونەری پزیشکیی و کاروباری پزیشکیی ڤێتیرینەری بەوەی هەستاوە بە نوسینی پەرتوکێك بە ناوی (Shalihotra Samhita) کە بە دێرینترین دانراوی پزیشکیی ڤێتیرینەری دادەنرێت لە وڵاتی هیندستان و لە دواییدا بۆ زمانەکانی فارسی و عەرەبی و ئینگلیزی وەرگێڕا، کە کۆمەڵێك زانیاری پزیشکیی لەخۆگرتووە لەوانەش :-

١. بەکارهێنانی ڕووەکە پزیشکییەکان لە چارەسەرکردنی نەخۆشییەکاندا.
٢. چۆنیەتی بەڕێوەبردن و بەخێوکردنی ئەسپەکان و پارێزگاری لە تەندروستیان .
٣. باسێکی زانستی توێکاری و فسیۆلۆژی ئەندامەکانی لەشی فیل و ئەسپی تێدا کردووەو هەروەها ئەو نەخۆشییانەی کە باوبووە

لەو دەمەداو هەمیشە داوای دەکرد کە پێویستە تەنها ئاژەڵە ساغەکان بچنە بازارەکان و کاریان پێبکرێت لەبەر ئەوەی ئاژەڵە نەخۆشەکان نەخۆشی بڵاودەکەنەوە.

٤. زۆر جۆری چارەسەری پزیشکیی تێدا تۆمارکراوە وەکو ئازارشکێنەکان و هەتوانەکان کە بۆ چارەسەری برینەکان و کێشەکانی کۆئەندامی هەرس بەکارهاتووەو لە ئەنجامی ئەم کارانەی (Shalihotra) کە کاریگەریەکی گەورەی هەبووە لەسەر دەسەڵاتدارانی ئەو سەردەمەو لە ساڵی (٣٠٠ پ.ز) و لە سەردەمی پاشای مەزنی هیندستان (Ashoka) یەکەمین نەخۆشخانەی ڤێترینەری دامەزراند لە جیهاندا بە مەبەستی ئامادەکردن و پوختەکردن و پۆلێن کردن و هەڵگرتنی جۆرە جیاوازەکانی ڕووەکە پزیشکییەکان و بەکارهێنانیان لە چارەکردنی مرۆڤ و ئاژەڵە نەخۆشەکان.

**چوارەم / سەردەمی چینی کۆن :**

ڕەشەوڵاخ و ئەسپ بەخێوکردن لە چین مێژووییەکی کۆنی هەیەو نوسراوە مێژووییەکان بەڵگەن لەسەر بایەخپێدانی شارستانیەتی کۆنی چین بە



تەندروستی ئاژەڵ و هەوڵدان بۆ پارێزگاریکردنی بەوەی پزیشکانی چینی کۆن دەرزی ئاژنین (Acupuncture)یان وەکو چارەسەرێکی پزیشکیی سەرکەوتوانە بەکارهێناوە لە چارەکردنی ئەسپی شەل و ئەوانەی ژانە سکییان هەبووەو هەروەها جۆرەها ڕووەکی پزیشکیان بەکارهێناوە .

**پێنجەم / سەردەمی مادەکان :**

به گوێرەی سەرچاوە مێژووییەکان گشت هۆزەکانی ماد بە کاری ئاژەڵدارییەوە خەریك بوون بە تایبەتی بەخێوکردنی ئاژەڵی گەورەی شاخدارو مەڕو بزن و ووشترو هەروەها شارەزاییەکی باشیان هەبووە لە



پەروەردەکردنی هەنگ و کاری کشتوکاڵ و ئاودێریدا ، بە شێوەیەك کە سامان و دەرامەتیان بریتیبووە لە مانگاو گا، ئەسپ ، مەڕو بزن.

مێژوونوسان دەڵێن ئەو ئەسپانەی کە لەسەر زەمینی ماد پەروەردە دەکران زۆر بەناوبانگبوون چونکە دانیشتوانەکەیان ئاشنایەتیان لەگەڵ ئەسپدا هەبووەو وەکو گیانلەبەرێکی ماڵی ڕایان گرتووەو تاڕادەیەکی باش شارەزاو کارامەبوون لە پەروەردەکردنی

ئەسپ و ماین کە هۆزە شوانکارەکان بەهۆی ئەسپەوە زیاتر جموجۆڵیان دەکردو بۆ ناوچەیەکی دیکە کۆچیان دەکرد.

مادەکان بە شێوەیەکی گشتی خەڵکێکی سوارچاك و دلێرو خۆبەختکەر بوون لەبەر ئەوە بایەخێکی زۆریان داوە بە تەندروستی ئاژەڵەکانیان لە دابینکردنی جێگاو ڕێگاو خۆراکی تەندروست بۆیان.

لە ساڵی (٦٨٨ پ.ز) کوردێکی پزیشك بە ناوی (ئاریاتە) کە زاناو داهێنەرێکی بەناوبانگ بوو پەرتوکێکی مەزنی لە هونەری پزیشکیدا بە زمانی کوردی داناوەو بە ئەلفوبێی کوردی نوسیوەتەوە.

# پێگەی ئەسپ

## لە مێژووداو ڕەنگدانەوەی لە پیشەی پزیشکیی ڤێتەرینەری



## - پێگەی ئەسپ لە مێژووداو ڕەنگدانەوەی لە پیشەی پزیشكیی ڤێترینەری :

ئاژەڵ بە شێوەیەكی گشتی بەشێكی سەرەكی ژینگە پێكدەهێنن و لەگەڵ مرۆڤ پێكەوە سەرگۆی زەوی ئاوەدان دەكەنەوەو بەردەوامی دەدەن بە ژیان بە شێوەیەك پێویستیان بە یەكدی هەیەو یەكدی تەواو دەكەن. لە ڕووی بایۆلۆژییەوە ئاژەڵ جیاوازیەكی ئەوتۆی لەگەڵ مرۆڤدا نییە ، واتە لەشی ئاژەڵ و باڵندەكان پێكهاتووە لە خانەو شانەكان و ئەندامەكان و كۆئەندامەكان و بە پێی سەرچاوە مێژووییەكان پشتبەستوو بە زانستەكانی فسیۆلۆژی پزیشكیی تێگەیشتن لە چۆنیەتی كاری ئەندام و كۆئەندامەكانی لەشی ئاژەڵ هۆكارێكی باشبووە بۆ تێگەیشتن لە كاری ئەندامەكانی لەشی مرۆڤ.

ماڵیكردن و بەخێوكردنی ئاژەڵە بەهێزەكانی وەكو وڵاخەبەرزە لە ئەسپ و ماین و ئێسترو گوێدرێژ مێژوویەكی كۆنی هەیەو زۆر هاوكاری مرۆڤیان كردووە لە كاروباری كشتوكاڵ لە كێڵانی زەوی و هاتوچۆ و گواستنەوە لەنێوان ناوچەكانداو هەروەها ڕۆڵی سەرەكیان هەبووە لە جەنگ و لەشكركێشیەكاندا. ئەسپ وەكو گیانلەبەرێكی قەشەنگ و بەهێز بە درێژایی دیرۆكی مرۆڤایەتی ئامادەییەكی بەردەوام و لەبەرچاوی هەبووە لە ژیانی مرۆڤدا لە كۆمەڵگەكانداو هەمیشە وەكو سومبولی هێز سەیری كراوەو ڕێزی لێگیراوەو خزمەتكراوە تا گەیشتۆتە ئەم سەردەمەی ئێستامان بەوەی لە جیهاندا ژمارەیەكی زۆر یانەی تایبەت هەن بە وەرزشی ئەسپسواری و سوارچاكی و ساڵانە پێشبڕكێی ئەسپسواری

دەكرێت لەنێوانیاندا و پارەیەكی زۆر خەرجدەكرێت لەپێناو كڕینی ئەسپە ناوازەكان و بەهێزەكان بە مەبەستی بردنەوەی خەڵاتە گرانبەهاكان و ئێستاش لە شارەكانی كوردستان چەندەها یانەی تایبەت دامەزراوە بۆ بەخێوكردن و پەروەردەكردنی ئەسپی ڕەسەنی كوردی بە شێوەیەكی زانستیانە.



لە سەدەكانی حەڤدەیەمین و هەژدەیەمینی زاینیدا لە وڵاتانی كیشوەری ئەوروپا زۆر بایەخ دراوە بە ئەسپ و ئەسپسواری بە شێوەیەك بنەماڵە دەسەڵاتدارەكان و دەوڵەمەندەكان زۆربەی ئەندامی خێزانەكانیان فێری ئەسپسواری و شمشێربازی دەكرد بۆ ئەوەی سوارچاكی كارامەیان لێدەربچێت، لەبەر ئەوە دەنێران بۆ ئەو شوێنە تایبەتانەی كە خولی فێربون و ڕاهێنانیان دەكردەوە لە بارەی چۆنیەتی مامەڵە كردن لەگەڵ ئەسپ و چۆنیەتی ڕاگرتنیان بە پاك و خاوێنی و پێدانی ئالفی بەسوود پێیان سەرەڕای ئەسپسواری و سوارچاكی، لەبەر ئەوە فێربونی ئەسپسواری یەكێك بووە لە بنەما سەركییەكانی پەروەردەی منداڵان لە وڵاتانی ئەوروپادا، هەروەكو لە ئەكادیمیای ئەسپسواری و سوارچاكی پەیڕەو دەكرا كە لە ساڵی (١٧٤٠ن) لە شاری لیۆن لە وڵاتی

فەرەنسا لەلایەن (Claude Bourgelat) دامەزراوە. بە پێی سەرچاوە مێژووییەکان لە سەدەکانی پێش و دوای زایین ئەسپ گیانلەبەرێکی زۆر پێویست و گرنگ بووە لە پێکهاتەی لەشکرەکانداو ڕۆڵی کاریگەریان هەبووە لە جەنگەکاندا بە شێوەیەك ئەو لەشکرانەی کە ژمارەی ئەسپ و ئەسپسوارەکانیان زیاتر بوایە بێ گومان سەرکەوتنیان مسۆگەر بووەو لەبەر ئەوە لەلایەن دەسەڵاتدارانەوە بایەخیان پێدەدراو گیانلەبەرێکی خۆشەویست بووە بە شێوەیەك مێژوونوسان دەگێڕنەوە کە دەسەڵاتدارانی ماد ( ٧٥٠ – ٥٥٠ پ.ز) زۆر ڕێزو نرخیان بۆ ئەسپ نیشانداوە بەوەی هەندێك جار ئەسپە ناوازەکانیان بە زێڕ داپۆشیوە. لەبەر ئەم پێگە گرنگەی ئەسپ لە ژیانی کۆمەڵی مرۆڤ بە درێژایی سەردەمەکانی کۆن و نوێی مێژوو وا پێویستی دەکرد کە کەسانێك شارەزاو لێهاتوو فێربکرێن و پەروەردە بکرێن بە زانستەکانی پزیشکیی ڤێترینەری لە چوارچێوەی پیشەی پزیشکیی ڤێترینەری کە لە ڕووی پزیشکیەوە بایەخ بە تەندروستی ئەسپەکان بدات وەکو پسپۆڕێك نەخۆشییەکانیان دەستنیشان بکات و چارەسەری پزیشکیان پێبدرێت و هەروەها گەر پێویست بوو نەشتەرگەری ئەنجام بدات و تیماری برینی لەشیان بکات، ئەبوایە ڕاهێنەری ئەسپەکان بە شێوەیەکی زانستیانە ئاراستە بکرێن بەوەی بە ڕەفتاری دروست لەگەڵ ئەسپەکاندا ڕەفتار بکەن بۆ ئەوەی هەمیشە تەندروست باش بن، ئەوەبوو لە ئەنجامدا بۆ یەکەمین جار لە سەدەی هەژدەیەمین و لە ساڵی (١٧٦١ز) یەکەمین خوێندنگەی ئەکادیمی لە بواری

پزیشکیی ڤێترینەری لە شاری لیۆن لە وڵاتی فەرەنسا دادەمەزرێت بە ناوی (Veterinary Medical School) لەلایەن زانای پزیشکیی ڤێترینەری (Claude Bourgelat)، کە لە ڕووی مێژووییەوە بە سەرەتای لەدایکبوونی (پیشەی پزیشکیی ڤێترینەری) دادەنرێت و بێ گومان دەرچوانیش پێیان دەوترێت (پزیشکیی ڤێترینەری) کە ئەو کەسە پسپۆرانەن بە فەلسەفەو زانستەکانی پزیشکیی ڤێترینەری فێرکراون و پەروەردەکراون، لە ئەنجامدا چارەسەرو دەستنیشانکردنی نەخۆشییە جۆر بە جۆرەکانی ئەسپ پێگەیەکی پزیشکی گرنگی لە زانستەکانی پزیشکیی ڤێترینەری دا هەیەو بە تایبەتیش لە تۆمارە کۆنەکان و دێرینەکانی پزیشکیی ڤێترینەری لە مێژووداو ئەمەش بێگومان لە پیشەی پزیشکیی ڤێترینەری دا ڕەنگیداوەتەوە، وەکو دەرەنجامێك دەتوانین بڵێین کە ڕۆڵ و پێگەی ئەسپ لە ژیانی مرۆڤ و کۆمەڵگاکاندا لە قۆناغە یەك لەدوای یەکەکانی مێژوو یەکێك بووە لەو هۆکارانەی کە ڕێگەیان خۆشکردووە بۆ دەرکەوتنی هونەری پزیشکیی ڤێترینەری لە سەردەمە کۆنەکان و لەدایکبونی پیشەی پزیشکیی ڤێترینەری لە ساڵی (١٧٦١ن) بەدواوە.

# ئەسپی ڕەسەنی کوردی



**- ئەسپی ڕەسەنی کوردی :**

سەرچاوە مێژووییەکان ئەوە دەخەنەڕوو کە زۆر لە کۆنەوە کوردەکانی دانیشتوی زنجیرە چیاکانی زاگرۆس ئەسپیان ماڵیکردووەو بەخێویان کردووەو مێژووی ئەسپی کوردی بۆ هەزاران ساڵ پێش ئێستا دەگەڕێننەوە.



لە نزیکەی هەزارەی دووەمی پێش زایین زۆربەی دانیشتوانی سەرزەمینی ماد ئاشنایەتیان لەگەڵ ئەسپدا هەبووەو ئەسپیان بەخێوکردووە وەکو گیانلەبەرێکی ماڵی ڕایانگرتووەو بایەخیان پێداوەو تاڕادەیەکی زۆریش شارەزای پەروەردەکردنی بوون کە بۆ بارو هاتوچۆو گواستنەوەو سواری بەکاریان ئەهێنا. سوارچاکی لای کورد مێژووییەکی دوورو درێژی هەیە هەروەك مێژوونوسی گەورەی یۆنانی هیرۆدۆت (٤٨٤ – ٤٢٥ پ.ن) دەنوسێت ئارياییەکان لە تەمەنەکانی پێنج تا بیست ساڵان سێ شتیان فێری منداڵەکانیان دەکەن کە ئەوانیش سوارچاکی، نیشانە شکێنی و ڕاستبێژی.

مێژوونوسان ئاماژە بەوە دەکەن کە باشترین ئەسپی جیهان لە دەشتی مادەکاندا بووە بە شێوەیەك بایەخیان پێداوە دەگێڕنەوە کە

ڕازاندنەوەی ئەسپی سوپای ماد لە ئەسپی سوپای گەلانی دیکە جیاوازتر بووەو لە ئەنجامدا ناو و ناوبانگی ئەسپی کوردی وایکرد سنورەکانی کوردستان ببەزێنێت و بچێتە وڵاتانی عەرەب و ڕۆژئاوا.



ئەسپی ڕەسەنی کوردەواری کۆمەڵێك خەسڵەتی تایبەتی هەیەو بە پێی قسەی شارەزایان ئەسپی کوردی بەوە جیادەکرێتەوە لە ئەسپەکانی دیکە بەوەی چوارپەلی واتە دەست و لاقی بڕێك ئەستورترەو سمەکانی بچوکترە بە بەراورد بە ئەسپی عەرەبی و قەپۆزی ئەسپی کوردی تۆزێك بەرانپۆزە واتە کەوانەییەو ئەسپێکی بەتواناو خۆشبەزەو لە ڕۆیشتندا سەروگوێ و کلکی زۆر جوان دەگرێ و لە پەلهاویشتندا گەلێك ڕێك و پێکەو تاقەتی لە گشت ئەسپێك زیاترە.

ئەسپی کوردی چەند ڕەنگێکی هەیە باوترینیان خۆڵەمێشی، کایی ، ڕەش یان شین ، سەریان درێژ و ناوچەوان پان و کەمێك قۆقزە ، گەردنیان بەرزەو سەرو گوێلاکیان خانەدانانە دەردەکەوێت، کونەلوتەکانیان گەورەو کراوەن و گوێچکەکانی مامناوەندو ڕەق و ڕێك دەجوڵێن ، چاویان گەش و ئاویە. لەش و لاری ئەسپی کوردی

ڕێک و باڵابەرزە، کلکی جوان و بەقژە، مووەکانی لەشی کورتو بریقەدار دەردەکەوێت، سکیان درێژو پانکەڵە دەبێتەوە تاکو بەرەو قاچەکانی بڕۆی زیاتر پانتر دەردەکەوێت، سنگیان درێژ دەردەکەوێت و ناوشانیان پان و گۆشتنە، پشتیان درێژو پانە گونجاوە بۆ ڕاگیرکردنی زین، سمتی ڕێکەو لێژییەکی بە ئەندازەیی هەیەو خوار دەبێتەوە بەرەو قاچەکانی دواوەی، قاچەکانی درێژو ئەستوورو پتەون و بەهێزن ، ئێسکی قاچەکانی سەرەڕای پتەویان کێشیان سوکەو گونجاون بۆ ڕاکردن و ڕێکردن. بە گوێرەی مێژوونوسی مێژووی پیشەی پزیشکیی ڤێترینەری لە وڵاتی کۆماری ئیسلامی ئێران دکتۆر حەسەن تاج بەخش[٣] دەڵێت باشترین و جوانترین ئەسپ لە میزۆپۆتامیا دەکەوێتە ناوچەی کەرکوك لە باشوری کوردستان کە بە ئەسپی کەرکوك ناسراوە.



لەم سەردەمەشدا لەبەر گرنگی ئەسپ و ئەسپسواری لە کوردستان، کۆلێجی پزیشکی ڤێترینەری لە زانکۆی سلێمانی لە ڕێکەوتی ٢٠٢٠/١/٩ سمپۆزیۆمی سازکرد سەبارەت بە حاڵەتە کلینیکیەکان لە وڵاخەبەرزە کە کۆمەڵێك بابەتی لەخۆگرتبوو سەبارەت بە نەخۆشییە جۆر بە جۆرەکانی ئەسپ و

**ماین و هەروەها لە لایەن شارەزایانەوە لە کاروباری ئەسپی ڕەسەنی کوردی جەخت لەوە کرایەوە کە پێویستە هەوڵەکان یەکبخرێن بە مەبەستی پارێزگاریکردن و گەشەپێدانی ئەسپی ڕەسەنی کوردەواری وەکو سامانێکی نەتەوەیی.**

# سەردەمی یۆنان و ڕۆمان



- **سەردەمی یۆنان و رۆمان :**

هەموو پیشەیەك مێژوویەكی هەیەو دەركەوتنی وەكو پیشە دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمێكی مێژوویی و لە پشت هەر پیشەیەكەوە زانستێك هەیەو بێگومان لە پشتی هەر زانستێكەوە فەلسەفەیەك هەیە.

گەورە بیرمەندو فەیلەسوفەكانی شارستانیەتی یۆنانی كۆن لە سوقرات و هیپۆكرات و ئەفلاتۆن و ئەرستۆ كە تا ئەم سەردەمەش كاریگەریان دیارە بەسەر بیرو فەلسەفەی مرۆڤایەتی بەشێوەیەك كە هەمیشە بەرهەمەكانیان وەكو سەرچاوەیەكی هزری و فەلسەفی و مەعریفی ڕێگاكانیان ڕوناك كردۆتەوەو مرۆڤەكانیان وریاكردۆتەوە، بەمەش بێگومان كەڵكیان لێوەرگیراوە بۆ تێگەیشتن لە نهێنیەكانی ژیانی مرۆڤایەتی و بونەتە جوڵێنەری گۆڕینی باری مرۆڤەكان و كۆمەڵگاكان كە بەرەو باشترو گونجاوتر هەنگاو بنێن.

مێژوونوسان دەگێڕنەوە بەوەی فەلسەفەو زانستی پزیشكیی یۆنانی كۆن كاریگەرییەكی ڕاستەوخۆی هەبووە لەسەر دەركەوتن و سەرهەڵدانی فەلسەفەو زانستی پزیشكیی ڤێترینەری لە مێژوودا، بە پێی سەرچاوە مێژووییەكانی سەردەمی یۆنانی كۆن زانای یۆنانی (Alcmaen دەوروبەری ٥٠٠ پ.ز) بۆ یەكەمین جار هەستاوە بە توێكاری لاشەی ئاژەڵەكان بە مەبەستی لێكۆڵینەوەی زانستی و لە ئەنجامدا تێگەیشتن لە كاری ئەندامەكان و هەروەها ئاماژەش بەوە دەكەن كە هەردوو بیرمەندو فەیلەسوفی گەورەی یۆنان هیپۆكرات و ئەرستۆ ڕۆڵی لەبەرچاویان هەبووە لە دەركەوتن و پێشكەوتنی هونەری پزیشكیی ڤێترینەری (Veterinary Medicine art) لەنێو كۆمەڵگای یۆنانی كۆن.



هیپـــــۆکرات[٤] (Hippocrates ٤٦٠ – ٣٧٧ پ.ز ) فەیلەسـوف و پزیشکی یۆنانی کە لە مێژوودا بە باوکی زانستی پزیشکیی ناسراوە ڕۆڵـی سـەرەکی هـەبووە لـە دانـانی بنـەما سـەرەکیەکانی فەلسـەفەی زانسـتی پزیشـکیی و هـەروەها فەلسـەفەی زانسـتی پزیشـکیی ڤێترینـەری و زۆر لـە بیردۆزەکـان و دیدو بۆچونەکانی لـە چوارچێوەی پەرتوکێکدا بڵاوکردەوە بەناوی سروشتی ئاژەڵان (The nature of animals) و دەتوانین بڵێین کە هیپـۆکرات داهێنـەری زانسـتی پزیشـکیی نـویَ یـە بـەوەی زۆر لـەو زاراوە زانستیە پزیشکیانەی کە بەکاری هێناوە لەو دەمەدا تاکو ئەم دەمـــەی ئێســـتاشمان بـــەکاردەهێنرێت لەلایـــەن ناوەنـــدە پزیشکییەکانەوەو لە کۆلێجە پزیشکییەکان دەخوێنرێت و هـەروەها هیپـۆکرات هەسـتاوە بـە وەسـفکردن و ڕاڤـەکردنی نەخۆشـییەکانی مەڕو بـەرازو گا وەکو نەخۆشی ئاوبەندی سنگ (Hydrothorax) و هەروەها دەستنیشانکردنی نەخۆشی لە جێچوونی جومگـەی حـەوز ( Dislocation of Hip joint) لە ڕەشەولاخدا.

بـە پێـی ووتـەی مێژوونوسـان برایـەکی هیپـۆکرات بـەناوی (Sosandar) یـەکێك بـووە لـە پزیشـکانی ڤێترینـەری کـە لـەو سـەردەمەدا پێـی گـوتراوە پزیشـکی ئەسـپ (Horse doctors)، ئەمـەش بێگومـان لەبەر بایـەخی ئەسـپ و پێگـەی ئەسـپ لـە ژیـانی

کۆمەڵانی خەڵکی ئەو سەردەمە هەروەکو لە بەشەکانی پێشوتردا باسمان لێوەکرد.

گەورە فەیلەسوفی یۆنانی ئەرستۆ (Aristotle ٣٨٤ – ٣٢٢ پ.ز) تەمەنی تەنها حەوت ساڵان دەبێت کاتێك فەیلەسوفی یۆنان هیپۆکرات کۆچی دوایی دەکات و لە دواییدا دەبێتە خوێندکاری گەورە بیرمەندو فەیلەسوفی یۆنانی کۆن ئەفلاتۆن (Plato).



کارەکانی ئەرستۆ بریتیبووە لە بایەخدان بە ڕووەکەکان و گیانلەبەران لە تۆمارکردنی ناوەکانیان و خەسڵەتە جیاکەرەوە گرنگەکانیان و هەروەها پۆلێنکردنی ئاژەڵ و باڵندە جۆر بە جۆرەکانی سروشت بە پێی شێوەکانیان و پێکهاتەی لەشیان و شێوازی ژیانیان و کۆکردنەوەی گشت ئەم زانیاریانە لە پەرتوکێکدا بە ناوی مێژووی ئاژەڵان (History of Animals) ، لەبەر ئەم کارانەی ئەرستۆ لە مێژوودا بە باوکی زانستی بایۆلۆژی ناودەبرێت.

لە چالاکیە سەرەکیەکانی دیکەی ئەرستۆ هەروەکو تاقیکردنەوەیەکی پراکتیکی بە ئەنجامی دەگەیاند بریتیبوو لە توێکاری لاشەی ئاژەڵی مردارەوەبوو بە مەبەستی شارەزابوون لە زانینی شێوەو پێکهاتەی ئەندامەکانی لەشیان و شێوازی کارکردنیان و بەراوردکردن لە نێوانیاندا ، ئەمەش بێ گومان خۆی لە خۆیدا هۆکارێکی باش بوو کە ئەرستۆ بە کاری دەهێنا بۆ ناسین و تێگەیشتن لە پێکهاتەی لەشی مرۆڤ چونکە یۆنانیەکان هەروەکو

چینیەکان و هیندی یە کۆنەکان ڕێگەیان نەدەدا لاشەی مرۆڤە مردووەکان توێکاری بکرێت ، کە ئەم بیرۆکەیەش بووە بنەمایەکی بەهێزی زانستی پزیشکی بەراوردکاری (Comparative Medicine) ، کەواتە دەتوانین بڵێین کە لێکۆڵینەوە لە بابەتەکانی پزیشکی ڤێترینەری هۆکارێك بووە بۆ تێگەیشتن لە بابەتەکانی پزیشکی مرۆڤ هەر لە سەردەمی یۆنانی کۆنەوە لەسەردەستی ڕابەرانی پزیشکی یۆنانی کۆن هیپۆکرات و ئەرستۆ کە ئەمەش بێ گومان بووە بنەمایەك بۆ بیرۆکەیەکی فەلسەفی گرنگ لەژێر دروشمی ( یەك تەندروستی و یەك پزیشکیی ) کە هەتاکو ئەم سەردەمەی ئێستاشمان کاری لەسەر دەکرێت.



نوسەرو پزیشکی یۆنانی کلاودیۆس گالین (Claudius Galen ۲۰۱ – ۱۳۱ پ.ز ) هەستا بە گواستنەوەو بڵاوکردنەوەی بیروبۆچونەکانی هیپۆکرات و پزیشکە یۆنانیەکانی دیکە بۆ شاری ڕۆما کە پایتەختی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمان بوو، وەکو پزیشکێکی سەربازی چارەسەری برینەکان و نەخۆشییەکانی سەربازەکانی سەردەمی ڕۆمانی دەکردو بە بەناوبانگترین پزیشکی ڕۆمانی کۆن دادەنرێت ، لەو باوەڕەدا بوو کە تەندروستی مرۆڤ و ئاژەڵ زۆر پەیوەندی بە دەرکەوتنی شێوەکانی مانگ (Phases of moon) و نیشانە فەلەکیەکانەوە هەیە.

ئەویش وەکو ئەرستۆ دەسیکرد بە توێکاری ئاژەڵەکانی وەکو مەیمون و بزن و مەڕو بەرازو هەوڵیدا ئەو ئەنجامانەی کە

بەدەستیاندێنیّ بەکاریدەهێنا بۆ تێگەیشتن لە کاری ئەندامەکانی لەشی مرۆڤ بە تایبەتی ئێسکەکانی لەشی مرۆڤ کە پێویستە پزیشکان بیاناسن و دەیوت دەتوانن توێکاری مەیمونێك بکەن بە لابردنی ماسولکەکانی و زانیاری وەربگرن دەربارەی هەر ئێسکێك و دەیگوت ئەو مەیمونانە هەڵبژێرن و توێکاری بکەن کە زۆر لە مرۆڤ دەچن و لە ئەنجامی ئەم لێکۆڵینەوانەدا توێکاریزانی لە بواری مرۆڤ و ئاژەڵدا پێشکەوتنی بەخۆوە بینی و مێژوونوسان دەڵێن کە هونەری پزیشکیی ڤێترینەری لە سەردەمی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمان زیاتر گەشەکردنی پێوە دیاربوو بە تایبەتیش لە بواری دەستنیشانکردن و چارەسەری کێشەکانی ئەسپ و هەروەها لە ڕۆما زۆر لەو زاراوە تایبەتمەندانەی کە پەیوەندی هەبوو بە پزیشکیی ڤێترینەری سەریهەڵداو جێگیر بوو لە ناوەندە پزیشکیەکان لەوانەش( Veterinarius[٥] ، equarius medicus)[٦].

لە سەدەکانی سێیەمین و چوارەمینی زایینی و لە سەردەمی ئیمپراتۆریەتی بێزەنتیندا وە بە پێی مێژوونوسان پەرتوکی (Hippiatrika) بە کۆنترین و دێرینترین پەرتوك دادەنرێت لە بواری پزیشکیی ڤێترینەری کە کۆکراوەی کۆمەڵێك بابەتە کە پەیوەندی هەیە بە چارەسەرەکانی نەخۆشیەکانی پزیشکیی ڤێترینەری کە لەلایەن نوسەرانی یۆنانیەوە نوسراون و بڵاوکراونەتەوەو بێ گومان بە سەرچاوەیەکی گرنگی پزیشکیی ڤێترینەری دادەنرێت لەو سەردەمەداو دەگێڕنەوە کە لەشکری ئیمپراتۆریەتی بێزەنتین زۆر کەڵکیان لێوەرگرتووە لە چارەسەری ئەسپە نەخۆشەکانیان.

بە پێی سەرچاوەکانی مێژوو پزیشکیی ڤێترینەری بێزەنتی (Apsyrtus ٣٣٠ – ٣٨٠ز) کە پزیشکێکی سەربازی بووەو خزمەتی

کـردووه لـه لەشـکری ئیمپراتۆریـەتی رۆمـان بـه بـاوکی زانسـتی پزیشکیی ڤێتەرینەری ناودەبەن کە لە ناوەڕاستی سەدەی چوارەمی زاینیدا ژیاوەو زۆر بایەخی داوە بە وەسفکردن وە دەستنیشانکردن و چارەسـەرکردنی نەخۆشـییەکانی ئـاژەڵ بـە گشـتی و نەخۆشـییە بڵاوەکـانی ئەسـپ و زانیاریـە نوێیـەکانی تۆمـارکردووەو هەمیشـە بەدواداچونی زانستیانەی هەبووە بۆ چارەسـەرەکان و لـە سـەردەمی ئەمیشـدا چارەسـەرە پزیشـکیەکان گـۆڕانی بەسـەرداهات و بـەرەو پێشەوە هەنگاوی ناوە.

نوسینی پەرتوکێك لەلایەن (Flavius Vegetius ٣٨٣ – ٤٥٠ ز) کـه بەرهـەمێکی زانسـتی بـوو لـه بـارەی چـۆنیەتی بـەڕێوەبردن و چارەکردنی ئێسترەکان کە بە یەکەمین سەرچاوە دادەنرێت لە بواری دەستنیشانکردن و چارەسەرکردنی نەخۆشییەکانی ئێستر و نوسەر ئـەوەی تێـدا ڕوونکردۆتـەوە کـە نەخۆشـییەکان بـەهۆی هۆکـارە سروشـتیەکانەوە ڕوو دەدەن نـەوەکو ڕووحـە شـەڕانگێزەکان و لـە ئەنجامدا لەبەر دەوڵەمەندی لە زانیاریـەکانی ئەم پەرتوکە تـوانرا تـا سەردەمی ڕێنیسانس سودی لێوەربگیرێت.

لەلایـەکی دیکـەوە هەنـدێك لـە مێژوونوسـانی دیکـە ( Vegetius Renatus ٤٥٠ – ٥٠٠ ز) بە بـاوکی زانسـتی پزیشـکیی ڤێترینـەری ناودەبـەن بـەوەی زۆر لـە کارەکـانی لـە بـواری پزیشـکیی ڤێترینـەری تۆمـار کـردووەو هاوشـێوەی هیپـۆکرات بـڕوای بـەوە هـەبووە کـە هۆکـارە سروشـتیەکان بـە شـێوەیەکی سـەرەکی دەبنـە هـۆی نەخۆشکەوتنی گیانلەبەران و هەروەها کاریگەری مانگی پیشانداوە لەسـەر ئەسـپەکان و زاراوەی شـەوکوێری لـە ئەسـپدا ( Moon blindness) بەکارهێناوە.

## - سەردەمە تاریکەکان :



زۆربەی مێژوونوسان سەدەکانی ناوەڕاست لە مێژووی مرۆڤایەتیدا کە ساڵەکانی دەورووبەری (٥٠٠ – ١٤٠٠ز) دەگرێتەوە بە سەدە تاریکەکان (Dark ages) ناو دەبەن، ئەمەش لەبەرئەوەی دیاردەی دواکەوتن لە گشت ڕوویەکەوە گشت جومگەکانی کۆمەڵی مرۆڤایەتی گرتبۆوە بە شێوەیەك ئاراستەی ڕەوڕەوەی مێژوو بەرەو دواوە بوو، بێگومان هۆکاری سەرەکی ئەم دیاردەیەش پشتکردنە زانست و زانین بوو بەوەی لێکدانەوەی نازانستیانە وەك لێکدانەوەیەکی باو بۆ مەسەلە جۆر بە جۆرەکانی ژیان و گەردوون جێگەی لێکدانەوە زانستیەکانی زانایانی گرتبۆوە، لەبەرئەوە پیاوە ئاینیەکان واتە قەشەکانی کەنیسەکانی ڕۆما کتێبە زانستیەکانیان نەدەخوێندەوەو پشتیان کردبووە زانایان و بیرمەندان و هەمیشە هۆکاری نەخۆشییەکانیان دەگەڕانەوە بۆ تۆڵەکردنەوەی خوا لە مرۆڤە گوناهبارەکان و لە ئەنجامدا لەو سەردەمەدا خوێندنی زانستە پزیشکیەکانیان قەدەغە کردو کارنەدەکرا بە زانیاریە

پزیشکیەکان لە چارەکردنی نەخۆشیەکانی مرۆڤ و ئاژەڵ و زیاتر نەخۆشـەکان لەلایـەن پیـاوە ئاینیەکانـەوە سەرپەرشـتیدەکران و چارەدەکران بە شێوازێکی ئاینیانەی دوور لە بەرکامێنانی بنەما زانستیەکان.



لە ساڵی (١٣٤٧ز) نەخۆشی تاعون (Plague) لەنێو مرۆڤ و ئاژەڵ بڵاوبۆوە کە بە یەکێك لە نەخۆشییە مرۆژەڵییەکان (Zoonoses) دادەنرێت کە لە مشکەوە دەگوێزرێتەوە بۆ مرۆڤ و بووە هۆی لەناوچوونی ژمارەیەکی زۆر لە گیانلەبەران و هەروەها لەناوچونی چواریەکی دانیشتوانی ئەوروپا بە شێوەیەك لاشەکان دەبران بۆ قەراغ شارەکان و دەسوتێنران ، لەبەرئەوە لە مێژوودا نەخۆشی تاعون بە مەرگی ڕەش (Black Death) ناسراوەو بە یەکێك لە کارەساتە گەورەکانی مێژوو دادەنرێت کە بەسەر مرۆڤایەتیدا هاتووەو دەتوانین بڵێین کە سەدەکانی ناوەڕاست بە سەدە

وەستاوەکانی مێژوو دائەنرێت چونکە بە پێی قسەی مێژوونوسان هیچ گۆڕانکاریەك لە بواری زانست و ئەدەبدا بەدینەکراوەو خەڵکی بە شێوەیەکی گشتی ناڵاندویانە بەدەست نەخۆشی و هەژاری و جەنگەکانەوە.

# سەردەمی ئیسلام



- سەردەمی ئیسلام :

قورئانی پیرۆز کە بە سەرەکیترین و یەکەمین سەرچاوەی یاسای موسوڵمانان دادەنرێت و لە زۆر لە ئایەتەکاندا خوای گەورە ناوی ئاژەڵەکانی هێناوەو هەندێك سورەت بە ناوی گیانلەبەرانەوە ناونراوە هەروەکو سورەتەکانی (البقرة – النمل – النحل – العنكبوت – الفيل – العاديات) ، ئەمەش بێگومان ڕۆڵی پڕ بایەخی گیانلەبەران دەردەخات لە ژیانی موسوڵمانانداو خوای گەورە ئامۆژگاری موسوڵمانان دەکات کە پێویستە مافی ئاژەڵان پارێزراوبێت و لەگەڵ گیانلەبەرانی بێزماندا بەسۆزو بەزەییەوە مامەڵەیان لەگەڵدا بکرێت بە هەمان شێوە لە فەرمودەکانی پێغەمبەری ئیسلام (د.خ)دا دەردەکەوێت کە جۆرەکانی ئاژەڵ و بەروبوومەکانیان زۆر پێویستن بۆ ژیانی موسوڵمانان، لەبەر ئەوە داوا دەکات موسوڵمانان بەگشتی لەگەڵ ئاژەڵەکانیاندا بە بەزەییانە ڕەفتار بکەن و ئازاریان نەدەن و هەمیشە ئاگایان لە جێگاو ڕێگاو خۆراك و تەندروستیان بێت ، بە هەمان شێوەی سەردەمەکانی پێشوتر زۆر گرنگی دراوە بە وڵاخەبەرزەی وەکو ئەسپ و ماین و پێغەمبەری ئیسلام (د.خ) لە یەکێك لە فەرمودەکانی بە موسوڵمانان ڕادەگەیەنێت کە پێویستە بایەخ بە بەخێوکردنی ئەسپ و ماینەکان بدرێت . وە بە گوێرەی مێژوونووسە موسوڵمانەکان ئیمام عەلی کوڕی ئەبو تالیب زۆر ئارەزووی ئەسپ و ئەسپسواری کردووەو زۆر جار خۆی چارەسەری کێشەکانی ئەسپەکانی کردووەو برینەکانی تیمار کردووە.

ڕۆژهەڵات بە شێوەیەکی گشتی لە سەردەمی خەلافەتی عەباسیدا هــەنگاوی لەبەرچــاوی بــەرەو پێشــکەوتن و شارســتانیەت نــاوە، ئەمەش بێگومان لە ئەنجامی بایەخدانی دەسەڵاتدارانی عەباسـی و بە تایبـەتی لـە مـاوەی دەسـەڵاتی هـاروون ڕەشـید بـە بزوتنـەوەی وەرگێـڕان بـەوەی ناوەنـدێکی تایبـەتی بە وەرگێـڕان دامەزرانـد بـە نـاوی بـەیت و الحکمـة هەسـتان بـە وەرگێڕانــی بەرهەمـە هـزری و فەلسـەفیەکانی بیرمەنـدو فەیلەسـوفەکانی یۆنـان و ڕۆمانیـەکان لـە سوقرات و هیپـوقرات و ئـەفلاتۆن و ئەرستۆو گـالین بـۆ سـەر زمـانی عــەرەبی و لــە ئەنجامــدا کاریگەریــەکی زۆری بەجێهێشــت لەســەر کۆمەڵگای ئەو سەردەمەو هونەری پزیشکیی ڤێتیرینەری یـەکێك بـوو لـەو بوارانــەی کـە گۆڕانکـاری گرتیــەوە چـونکە زۆر لـە پەرتوکـە پزیشکیەکانی یۆنان و ڕۆمانیەکان بە زمانی عـەرەبی بڵاوکرایـەوە ، بەپێی ووتەی (ابن قيم الجوزية) لە پەرتوکی (الطب النبي) دەڵێت : ناوی پزیشك بە هەموو ئەو کەسانە ئەوترێت کە مامەڵەی پزیشکیی لەگەڵ ئاژەڵ یان مرۆڤی نەخۆشدا دەکەن.

لەو سەردەمەدا زانستی پزیشکیی ڤێتیرینەری (علم طب البيطرة) بەو زانستە دەوترا کە لە کاروباری ئاژەڵان دەکۆڵیەوە بە تایبەتی لـە کاروبـاری وڵاخــە بــەرزە لــە چـۆنیەتی بــەڕێوەبردن و پاراســتنی تەندروستیان لە دەردو نەخۆشییەکان.

لە سەردەمە جیاجیاکانی خەلافـەتی عەباسیدا نـاو بەنـاو هـەردوو نەخۆشی تاعون و هاری سەگ لەنێو ئاژەڵاندا تەشـەنەی دەکـردو لـە ئەنجامـدا دەگوازرایـەوە بۆ مرۆڤەکان و زەرەری گـەورەی دەگـەیانـدە

سەر تەندروستی گشتی و گەورە نوسەری ئەو سەردەمە (جاحظ) لە پەرتوکی ئاژەڵان (كتاب الحيوان)دا ئاماژەی بە نەخۆشی هاری سەگ دەكات وەكو یەكێك لە نەخۆشییە مرۆژەڵییەكان كە لە سەگە هارەكانەوە دەگوێزرێتەوە بۆ مرۆڤ.

بە پێی قسەی مێژوونوسان پەرتوكی (كامل الصناعتين في البيطرة) بە یەكەمین پەرتوكی پزیشكیی ڤێتریینەری دادەنرێت لە سەردەمی ئیسلامدا كە لەلایەن بەناوبانگترین پزیشكیی ڤێتریینەری ئەو سەردەمەوە نوسراوە بە ناوی ( اخي[٧] حزام محمد بن يعقوب الجبلي) لە ساڵی (٩٠٢ز) ، ئەم پەرتوكە سەرچاوەیەكی زۆر گرنگە ، بەوەی جۆری چارەسەری نەخۆشییە جۆراوجۆرەكانی ئاژەڵی تێدا تۆماركراوەو هەروەها لە ساڵی (١٢٠٩ز) ئەحمەد كوڕی حەسەن كوڕی ئەحنەف پەرتوكێكی بڵاوكردەوە بە ناوی (طب بيطرة).



## - سەردەمی ڕێنیسانس :

گـەورە مێژوونوسـی کـورد دکتـۆر (کـەمال مەزهـەر ئەحمـەد) سەبارەت بە ڕێنیسـانس دەڵێت جێگایـەکی دیـاری لـە سەرانسـەری مێژووی شارستانیەتی مرۆڤایەتیدا هەیە ، سەرپاکی ئەو داهێنانە فیکری و زانستی و هونەریانەی ئەو سەدەیە پێشکەش بە مێـژووی مرۆڤایـەتی کردو ئەو گۆڕانە بنچینەیی یەی لەشێوەی تێڕوانینی مرۆڤدا بەرامبەر بە ژیان هێنایە گۆڕێ بە ڕادەیەك کاریـان لـە ڕەوتـی گەشەکردنی کۆمەڵگای مرۆڤایـەتی کردو دەتـوانین بڵـێین نـاوەڕۆکی ڕێنیسـانس خـۆی لـە خۆیـدا قەڵـەمبازێك بـوو لـە مێـژووی سـەرجەم گەلانی جیهاندا.

لـە ناوەڕاسـتی سـەدەی پانزەهەمـدا بـەهۆی داهێنـانی ئـامێری چـاپکردنەوە چـاپکردنی کتێـب و بڵاوکراوەکـان پەرەیانسـەندو ژمارەیـان زۆر بـوو بـە شـێوەیەك گەیشـتە دەسـت گشـت خـەڵکی بەمـەش بـووە هـۆی پێشخسـتنی زانسـت و زانـین لـەنێو کۆمـەڵانی خەڵکـداو دەتـوانین بڵـێین ئـەم دیاردەیـە بـە سـەرەتای دەرکـەوتنی نیشـانەکانی ڕۆژگارەکـانی ڕێنیسـانس دادەنرێـت لـە وڵاتـانی کیشـوەری ئـەوروپا، کـە بـۆ یەکـەمین جـار لەلایـەن Johannes Gutenberg (١٣٩٨ – ١٤٦٨ز) کـە خـەڵکی وڵاتـی ئـەڵمانیا بـوو توانی یەکەم ئامێری لە تەختە دروستکراوی چاپ کردن دروست بکـاو سـەرنجامیش شۆڕشـێکی ڕۆشـنبیری بـەرپابکاو هـزری مرۆڤایەتی لە قۆناغێکەوە گواستەوە بۆ قۆناغێکی پێشکەوتوتر و شارسـتانیەتی ڕۆژئـاوای پـێ دەوڵەمەنـد کـردو وایلێهـات تـا سـاڵی

(١٥٠٠ن) ژمارەیەکی زۆر لە کتێب و بڵاوکراوەکان لە بواری جیاواز جیاوازدا چاپکران و بڵاوکرانەوە بە گشت وڵاتانی ئەوروپاو لە




ساڵی (١٥٣٢ن) پەرتوکی Hippiatria چاپکراوە کە بە یەکەمین پەرتوکی چاپکراو دادەنرێت لە مێژوودا لە بواری پزیشکیی ڤێترینەری کە لەلایەن (Laurentius Rusius)نوسراوە کە بایەخی داوە بە چارەسەرکردنی ئەسپە بریندارەکان و نەخۆشەکان.

لیۆناردۆ داڤنشی Leonardo da vinci (١٤٥٢ – ١٥١٩ن) گەورە بیرمەندو هونەرمەندو زانای ئیتاڵی کە بە یەکێك لە ڕابەرانی ڕۆژگاری ڕێنیسانس دادەنرێت لە مێژوودا سەرەڕای کارە داهێنەرەکانی لە بواری هونەردا خزمەتێکی ناوازەی بە زانستی پزیشکیی ڤێترینەری و پزیشکیی مرۆڤ گەیاندووە بەوەی کە هەستاوە بە توێکاری ژمارەیەك لە لاشەی ئاژەڵ و مرۆڤی مردوو بە مەبەستی بینینی ئەندامەکانیان و پەیکەری ئێسکەکانیان بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ و کێشانی هێڵکاریان بۆ لێکۆڵینەوەو بەراوردکردنیان بە شێوەیەکی زانستیانە، هەر لەبەر ئەمەش لە مێژوودا بە باوکی زانستی

تویکاری له قەڵەم دەدرێت چونکە تا ئەم سەردەمەش هێڵکاریەکانی سەبارەت بە ئەندامەکانی لەشی ئاژەڵ کەڵکێکی زۆری هەیە بۆ پزیشکانی ڤێترینەری و لە یەکێك لە هێڵکاریەکانیدا هەوڵی داوە زۆر زانستیانە هێڵکاری ڕەحمی مانگایەکی ئاوس (Pregnant Cow) بکێشێت کە زۆر سەرنجڕاکێشە ئەمەش بەوەی ئاوسییەکەی دەکەوێتە یەکێك لە شاخەکانی ڕەحم (Uterine horne) ئەمەش خۆی لە خۆیدا جیاوازیەکە لەنێوان



ڕەحمی مرۆڤ و مانگادا، داڤنشی زۆربەی کاری توێکاری لاشەکان لە شەودا ئەنجام داوەو لە یەکێك لە یاداشتەکانیدا کە لە دەفتەری تێبینیەکانی تۆماری کردبوو دەڵێت : ((پێویستە عاشقی پیشەکەتان بن و توێکاری لاشەکان باشترە لە سەیرکردنی وێنەکان بۆ ئەوەی بە واقعی و ڕاستەوخۆ ماسولکەکان و ئەندامەکان ببینم

## - سەردەمی ڕۆشنگەری :

زانایانی سەردەمی ڕۆشنگەری وا بیریان دەکردەوە کە کلیلی سەرکەوتنی داهاتوی ژیانی مرۆڤایەتی بریتیە لە زانست و زانین و وا پێویست دەکا لێکدانەوەی زانستی بۆ گشت لایەنەکانی کۆمەڵ و ژیان بە گشتی جێگەی لێکدانەوە نازانستی و میتافیزیقیەکان بگرێتەوە، لە ئەنجامدا مێژووی ژیانی مرۆڤایەتی شێوازێکی دیکەی وەرگرت بەوەی تێڕوانینی مرۆڤ بەرامبەر لایەنەکانی ژیان گۆڕانی بەسەرداهات و ئاسۆی بیرکردنەوەیان فراوان بوو، هۆکارەکانی ئەمانەش دەگەڕێتەوە بۆ لێکۆڵینەوەو توێژینەوەو دانانی پلانی زانستی کە بووە بنەمایەك بۆ گەیشتن بە چارەسەرو دۆزینەوەی ڕاستیەکان.

لە سەدەی هەژدەیەمدا، پەرەسەندنی کاری پیشەیی و چالاکیە پیشەسازیەکان و بازرگانیەکان و گەشەکردنی بازاڕ و کۆچکردنی بە لێشاوی گوندنشینەکان بەرەو شارەکان لە وڵاتانی ئەوروپادا بووە هۆی ئەوەی شاری گەورە گەورە بنیاتبنرێت و ڕۆژ لە دوای ڕۆژ ژمارەی دانیشتوانیان ڕوو لە زیادبوون بێ و لەگەڵ ئەمەشدا پێداویستیەکانیان لە گشت ڕوویەکەوە زیاد بکات بە تایبەتی پێداویستی یە خۆراکیەکان لە بەروبومەکانی ئاژەڵ و باڵندەکان، لەبەر ئەوە بەخێوکردن و بەرهەم هێنانی مەڕومالآت و ڕەشەولآخ و پەلەوەر گەشەیان کردو خاوەن زەوی یە گەورەکان چی زەوی بەپیتیان هەبوو کردیانە لەوەڕگای گەورە گەورەو بێگومان ئەمەش وایکرد کە ئامرازەکانی بەرهەم هێنان گەشە بکەن و ڕۆژ لە دوای

ڕۆژیش بەهۆی تاقیکردنەوە زانستی یەکانیانەوە شێوازی بەرهەم هێنان بەرەو پێشەوە ببەن لە لادێ و شارەکاندا.



هەموو ئەو گۆڕانە گەورانەو گرنگانەی وڵاتانی ئەورووپا بەخۆیانەوە دی لە سەدەی هەژدەیەمداو لە سەردەمی ڕۆشنگەری دا بێگومان لەگەڵ خۆیاندا بیری نوێ یان هێنایە کایەوەو لە ئەنجامیشدا پیشەی نوێ و زانستی نوێ یان هێنایە مەیدانەوە کە ساڵ لە دوای ساڵ وڵاتانی ئەورووپای ڕۆشن دەکردەوەو لە دوایشدا دەگەیشتە هەموو جیهان ، ئەوەبوو لەسەر دەستی (Claude Bourgelat) کە یەکێك بوو لە بیرمەندانی ڕۆژگاری سەردەمی ڕۆشنگەری لە وڵاتی فەرەنسا کە لە ڕێی بیروبۆچونە زانستیەکانیەوە ڕێگایەکی نوێ ی لە ژیانی مرۆڤایەتی ڕۆشن کردەوە ئەویش بە دامەزراندن و کردنەوەی دەرگای یەکەمین خوێندنگەی پزیشکیی ڤێترینەری لە شاری لیۆن لە وڵاتی فەرەنسا لە ساڵی ١٧٦١ز وەکو دەزگایەکی ئەکادیمی و زانستی بۆ خوێندنی زانستەکانی پزیشکیی ڤێترینەری لە چوارچێوەی پیشەی پزیشکیی ڤێترینەری ، لەبەر ئەوە دەتوانین بڵێین کە پیشەی پزیشکیی ڤێترینەری یەکێکە لە دەستکەوتەکانی ڕۆژگاری سەردەمی ڕۆشنگەری.

به گوێرەی مێژوونووسان مێژووی ساڵی لەدایکبوونی پزیشکیی ڤێتیرینـەری وەکو پیشـەیەکی ئـەکادیمی و پاڵپشـت بـە زانسـتەکانی پزیشـکیی ڤێتیرینـەری دەگەڕێتـەوە بـۆ سـاڵی ١٧٦١ز بـە شـێوەیەك دەرچـووانی کۆلێجـەکان و خوێندنگـە ئەکادیمیـەکانی پزیشـکیی ڤێتیرینەری وەکو کەسایەتیەکی ئـەکادیمی بە شێوازێکی زانستیانە کارەکانیـان ئـەنجام دەدا بـەوەی نەخۆشـییە جـۆراو جۆرەکـانی ئاژەڵـەکانیان دەستنیشـان دەکـردو چارەسـەریان دەکـردن و تەندروستی گشتیان دەپاراست و ئەمەش بێگومان لەدواڕۆژدا بووە هـۆی گەشـەکردنی سـامانی ئـاژەڵ و زیـادبوونی بەروبومـەکانی و پێشـکەوتنی پیشەسـازیەکان و لـە ئەنجامـدا پڕکردنـەوەی پێداویستیە خۆراکیەکانی هاوڵاتیان.

# Claude Bourgelat



بەکردنەوی دەرگایەکی نویٚ ڕیٚگەیەکی ڕۆشن کردەوە و

خزمەتیٚکی ڕاستەقینەی گەیاندە مرۆڤایەتی

## : Claude Bourgelat -

وەکو ئەرکێکی پیشەیی بە پێویستی دەزانم کە گشت پزیشکانی ڤێترینەری لە جیهانداو بە تایبەتی لە کوردستان زانیاریەکی باشیان هەبێت لە بارەی ژیان و کارو بەرهەمە ناوازەکانی Claude Bourgelat کە بە یەکێك لە پێشەواکانی سەردەمی ڕۆشنگەری و پێشەنگی پیشەی پزیشکیی ڤێترینەری دادەنرێت لە جیهانداو پێویستە وەکو سەرچاوەیەکی دەوڵەمەند کەڵکی لێوەربگیرێت.

Claude Bourgelat لە ١٧١٢/٣/٢٧ لە شاری لیۆن لە وڵاتی فەرەنسا لەدایکبووەو لە ١٧٧٩/١/٣ کۆچی دوایی کردووەو بنەماڵەکەیان لە بنەماڵە دیارەکانی شاری لیۆن بووە لەو سەردەمەدا، هەر لە تەمەنی منداڵییەوە خۆشەویستی بەخێوکردنی ئەسپ و خزمەتکردنیان یەکێك بووە لە ئارەزووەکانی لەبەرئەوە لە تەمەنی مێرمنداڵییەوە بووە سوارچاکێکی بەناوبانگ لە ناوچەکەدا و شارەزاییەکی باشی لە هونەری سوارچاکی و ئەسپ سواریدا بەدەستهێناو هەر ئەمەش وایکرد لە دواییدا ببێتە پزیشکێکی ڤێترینەری دیارو کاریگەر لە دۆزینەوەی چارەسەری پزیشکی بۆ

کێشەکانی ئەسپ و سامانی ئاژەڵ بە شێوەیەکی گشتی و هەروەها تێگەیشتنێکی باشی هەبووە لە بواری ئابوری پیشەسازییەکانی بەرووبومە ئاژەڵییەکان و لە هەمان کاتدا پارێزەر بووەو چالاکانە بەرگری لە یاساکان کردووە بە مەبەستی بەدیهێنانی دادپەروەری لە وڵاتدا.

Claude Bourgelat لە ڕۆژگاری سەردەمی ڕۆشنگەریدا لە فەرەنسا لە سەدەی هەژدەیەمدا ژیاوەو قۆناغەکانی ژیانی بە سەرکەوتویی بڕیوە بە شێوەیەك لە دواییدا بووە بە یەکێك لە بیرمەندان و پێشەواکانی سەردەمی ڕۆشنگەری لە پاڵ هاوڕێ فەیلەسوفەکانی وەکو ڤۆلتێرو دیدرۆ بەوەی هەمیشە لە هەوڵی ئەوەدا بوون ڕێگاکان ڕۆشن بکەنەوە بە ڕێگە چارەی زانستیانەی نوێ لە چوارچێوەی پیشە ئەکادیمیەکاندا، لەبەر ئەوە Claude Bourgelat لە ڕێی زانستەکانی پزیشکیی ڤێتێرینەری و لە چوارچێوەی پیشەی پزیشکیی ڤێتێرینەری هەوڵیدەدا بە زانستی نوێ و بیری نوێ چارەسەرەکان بدۆزێتەوە بۆ نەخۆشییە جۆرەبەجۆرەکانی ئاژەڵ و پەلەوەرو پاراستنی تەندروستی گشتی لە نەخۆشییە مرۆژەڵییەکان و هەروەها هەمیشە کارکردن لەسەر بنەمای ((یەك تەندروستی و یەك پزیشکیی)) و لە ئەنجامدا ناو و ناوبانگی Claude Bourgelat سنورەکانی وڵاتی فەرەنسای تێپەڕاندو وەکو کەسایەتیەکی

زانستی جیهانی سەیری لێوە دەکرا، لەبەر ئەوە نازناوی ( پیاوی زانست)یان پێبەخشی ئەمەش بێگومان لەبەر ئەوەی ڕۆڵی چالاکی هەبووە لە کاروباری زانستی و ئەکادیمی وڵاتی فەرەنسا بەوەی هەمیشە بە لێکدانەوەی زانستیانە کێشەکانی سەردەمی خۆی لێکدایەوەو ڕێگەچارەی زانستیانەی نوێی پێشنییاز دەکردو لە ئەنجامدا دەرگای نوێی دەکردەوە، بەمەش ڕێگەی نوێی ڕووناك دەکردەوە لە مێژووی ژیانی مرۆڤایەتی.

لە سەدەی هەژدەیەمداو لەبەر ڕۆشنایی لاپەڕەکانی مێژوو بۆمان دەردەکەوێ Claude Bourgelat ڕۆڵێکی گەورەی لە ژیانی ڕۆشنبیری زانستی وڵاتی فەرەنسا و لە دواییدا گشت وڵاتانی ئەورروپاو جیهان دا بینیوەو چرایەکی درەوشەداری شارستانیەتی مرۆڤایەتیە.

لە ڕاستیدا کەس ناتوانێ داهێنانەکانی Claude Bourgelat لە مەیدانی زانست بە گشتی و زانستی پزیشکیی ڤێترینەری بە تایبەتی سەرژمێر بکا ، بەڵام لەپێناو کەڵك لێوەرگرتن لە داهێنانەکانی چەند کارو بەرهەمێکی داهێنەرانەی دەخەینەڕوو :-

**یەکەم :**

دامەزراندن و بەڕێوەبردنی ئەکادیمیای ئەسپ سواری و سوارچاکی



لە شاری لیۆن لە ساڵی ١٧٤٠ز ( Lyon Academy of HorsemanShip) .

**دووەم :**

بڵاوبونەوەی پەرتوکێکی گرنگ بە ناوی بنەماکانی ئەسپ سواری و سوارچاکی (Elements of HorsemanShip) کە لایەنەکانی هونەری ئەسپ سواری و سوارچاکی لەگەڵ چۆنیەتی بەخێوکردنی ئەسپ و هەروەها چۆنیەتی توێکاری لاشەی ئەسپی تێدا ڕوونکردۆتەوە.

**سێیەم :**

لە تەمەنی سی و دوو ساڵی پەرتوکێکی بڵاوکردەوە بە ناوی (A New Treatise on Horseman Ship) کە کۆمەڵێك زانیاری گرنگی لەخۆگرتبوو لە بارەی کارامەیی و شارەزایی لە هونەری ئەسپ سواری و سوارچاکی.

**چوارەم :**

بەهۆی چالاکیە داهێنەرە زانستی یەکانیەوە بوو بە ئەندام لە ئەکادیمیای زانستەکان (Academy of Sciences) شاری پاریس لە وڵاتی فەرەنسا ئەمەش بەهۆی ڕۆڵی چالاکی لە بڵاوکردنەوەی هۆشیاریی زانستی لەو وڵاتەدا.

**پێنجەم :**

لەلایەن هەردوو بیرمەندی سەردەمی ڕۆشنگەری (Diderot ، d'Alembert) بانگهێشکرا وەکو نوسەرێکی بەتوانا بەشداربێت لە نوسینەوەی بابەتەکانی پرۆژەی ئینسایکلۆپیدیا کە فەرهەنگێکی فراوان بوو لەو سەردەمەدا لەلایەن ئەکادیمیای زانستەکانەوە ئامادە دەکراو لە ساڵی ١٧٥١ز یەکەمین بەرگی لێ بڵاوکرایەوە. Claude Bourgelat کۆمەڵێك بابەتی زانستی گرنگی لە بارەی کارامەیی و شارەزایی لە هونەری ئەسپ سواری و سوارچاکی و ناڵبەندی لە ئەسپ و ماینددا بڵاوکردەوە کە لە ساڵی ١٧٥٥ز ژمارەی بابەتەکانی گەیشتە دوو سەدو پەنجاو پێنج ووتار، لەڕێی ئەم بەرهەمانەوە توانی هاوڕێیەتی و پشتگیری هەردوو بیرمەندی گەورەی فەرەنسا لە سەردەمی ڕۆشنگەری دا



(Voltaire , Malesherbes) بەدەستبهێنێت ، بە گوێرەی ووتەی


ENCYCLOPÉDIE,
OU
DICTIONNAIRE RAISONNÉ
DES SCIENCES,
DES ARTS ET DES MÉTIERS,
PAR UNE SOCIÉTÉ DE GENS DE LETTRES.
TOME PREMIER.
A PARIS,
M. DCC. LI.

مێژوونوسان بابەتەکانی ئەم فەرهەنگە گەورەیە لە ڕۆژگاری ڕۆشنگەری دا بووە هۆی گۆڕانی تێڕوانینی مرۆڤ و بیرکردنەوەیان سەبارەت بە ژیان و کۆمەڵگەکان و تا ئەم سەردەمەش کاریگەریەکانی بەردەوامە لەسەر ژیانی مرۆڤایەتی.

**شەشەم :**

وەکو سەرپەرشتیاری گشتی چاپ و چاپەمەنیەکان لە شاری لیۆن دەستبەکاربوو ئەمەش بە مەبەستی هەڵسەنگاندن و نرخاندنی بەرهەمە بڵاوکراوەکان لەو سەردەمەدا.

**حەوتەم :**

لە ساڵی ١٧٥١ز پەرتوکێکی زۆر بەکەڵکی چاپ کردو بڵاوکردەوە بە ناوی ( Elements of Hippiatry and New Knowledge of Equine Medicine) لە دوو توێی سێ بەرگدا کە بە هۆیەوە هەنگاوێکی ئامادەکاری بوو بۆ دامەزراندنی سستمێك بۆ

زانستەکانی پزیشکیی ڤێترینەری کە لە ئەنجامدا بووە بنەمایەکی زانستی لە پێناو بە زانستیکردن و بە ئەکادیمیکردنی بیروبۆچونە ڤێترینەریەکان و لە دواییدا لەدایکبوونی پیشەیەك بە ناوی پیشەی پزیشکیی ڤێترینەری .

**هەشتەم :**

لە ساڵی ١٧٥٧ز فەرهەنگێکی پزیشکیی ڤێترینەری چاپکرد بە ناوی ( New Practical Dictionary of Veterinary Medicine , Surgery and Hygiene) لە دوو توێی سێ بەرگدا لە شاری پاریس و ئەم کارە گرنگەش رێگەی زیاتر خۆشکرد بۆ کردنەوەی خوێندنگەیەکی ئەکادیمی تایبەت بە بواری پزیشکیی ڤێترینەری و لەدایکبونی پیشەی پزیشکیی ڤێترینەری.

**نۆیەم :**

Claude Bourgelat بە شێوەیەکی زانستیانە سەلماندی کە خوێندنی بابەتەکانی بایۆلۆژی و نەخۆشیزانی ڤێترینەری (Veterinary Pathology and Biology) یارمەتیدەرێکی گرنگە بۆ تێگەیشتن لە بابەتەکانی بایۆلۆژی و نەخۆشیزانی مرۆڤ (Human Pathology and Biology) ئەم ڕاستیەش خۆی لە خۆیدا بووە بنەمایەکی بەهێز بۆ زانستی (Comparative Bio pathology) کە لە ناوەندە پزیشکیەکانی جیهان تا ئەم سەردەمەیش سودیان لێوەرگرتووە.

**دەیەم :**

دامەزرانــدن و بــەڕێوەبردنی یەکــەمین خوێندنگــەی پزیشــکیی ڤێتەرینـەری لـە شـاری لیـۆن لـە وڵاتـی فەرەنسـا لـە سـاڵی ١٧٦١ز بـە ناوی (Royal Veterinary School) کە بە سەرەتای لەدایکبوونی پیشەی پزیشکیی ڤێتەرینەری دادەنرێت لە جیهاندا.

**یازدەیەم :**



دامەزرانـــــــــــــــــدن و سەرپەرشـــــــــــــتیکردنی خوێندنگەیـەکی ئـەکادیمی لـە بواری پزیشکیی ڤێتەرینەری لە شــاری ئــەلفۆرت لــە ســاڵی ١٧٦٥ز بە ناوی (Alfort Veterinary School) کە دەکەوێتە نزیک شاری پاریس .

**دوازدەیەم:**

بڵاوکردنــەوەی پــەرتوکێك بەناونیشــانی یاســاکانی خوێندنگــەی پزیشـکیی ڤێتەرینـەری شاهانە ( Rules for the Royal Veterinary School) کە لە ساڵی ١٧٧٧ز چاپکراوە.

**سیازدەیەم :**

زۆرجار لەلایەن پادشاکانی وڵاتانی دیکەوە بانگهێشکراوە، وەکو پادشـای وڵاتـی پۆڵەنـدا بـە مەبەسـتی ڕاوێـژی زانسـتی و دانـانی نەخشـە ڕێگایـەك بـۆ بـواری پزیشـکیی ڤێترینـەری لـەو وڵاتـەداو هەروەها ڕێکخستن و دامەزراندنی کێڵگەکانی بەخێوکردنی ئەسپی شاهانەی پادشای ئەو وڵاتە بە شێوازێکی زانستیانە.

کەواتـە Claude Bourgelat لـە سـەدەی هەژدەیەمـدا وەکـو کەسـایەتیەکی فـرە بـەهرە (Multitalented Person) لـە وڵاتـی فەرەنسـا درەوشـایەوە ، بـەوەی لەلایـەك ئەنـدامێکی کـارای ئـەکادیمیای پـاریس بـوو کـە چالاکانە بەشـداربوو لـە نوسـینەوەی بابەتـەکانی Encyclopedia و لەلایـەکی دیکـەوە سەرپەرشـتاری گشـتی بڵاوکراوەکـان بـوو لـە شـاری لیـۆن و هـەروەها نوسـەری چەندەها بابـەتی زانسـتی بـوو لـە بـواری پزیشـکیی ڤێترینـەری و دامەزرێنـەرو ڕاوێـژکاری چـەندەها خوێندنگـەی پزیشـکیی ڤێترینـەری بـوو لـە فەرەنسـا، کـە بێگومـان هـەموو ئەمانـە وایکـرد ببێتـە هـاوڕێی گـەلێك لـە بیرمەنـدو فەیلەسـوفە دیارەکـانی سـەردەمی ڕۆشـنگەری لـە فەرەنسـا وەکـو (Male Sherbes , Diderot , Voltaire and d'Alembert) و هـەروەها کەسـایەتیە ڕامیاریـەکانی ئـەو سـەردەمەش وەکـو (Henri – Leonard Bertin) کە خاوەن پۆستی ڕامیاری باڵا بوو پاڵپشتیەکی بەهێزی کارەکانی Claude Bourgelat بوون، بێگومـان ئەمـەش لەبـەر ئـەوەی نـاوەرۆکی گشـت بڵاوکـراوەو ووتارەکـانی و

بەرهەمە زانستیەکانی بریتیبووە لە لێکۆڵینەوەو گەڕان و لە ئەنجامدا گەیشتن بە ڕاستیەکان لە ڕێی بەکارهێنانی ئامرازە زانستیەکان و لە کۆتاییدا لە قازانجی مرۆڤایەتیدا دەشکایەوە.

Claude Bourgelat هەمیشە دەیگوت ئێمە کاردەکەین بۆ کردنەوەو ڕۆشنکردنەوەی ڕێگایەك لە ژیانی مرۆڤایەتیدا و پێویستە دوای ئێمە خەڵکی دیکە ڕێگاکانی دیکە بکەنەوەو ڕۆشنیبکەنەوە لەبەردەم مرۆڤایەتیدا.

لە ساڵی ١٧٧١ز گەورە بیرمەندو فەیلەسوفی فەرەنسا لە سەردەمی ڕۆشنگەریدا ، ڤۆلتێر بە چەند دێڕێك لە وەسفی Claude Bourgelat دا دەڵێت :

" Claude Bourgelat تۆ لە پزیشکەکانی دیکە ناچیت ئەوانەی کە خۆیان لە شوێنی خودا دادەناو بەهۆی کۆمەڵێك ووشەوە جیهانێکیان دەخولقاند، بەڵکو تۆ لە ڕێی بیرو بۆچوون و شارەزاییەکانتەوە دەرگایەکی نوێ دەکەیتەوەو خزمەتێکی ڕاستەقینە دەگەیەنیت بە کۆمەڵگا، بێگومان ئەمە کاری ڕاستەقینەی پزیشکەکانە".

# خوێندنگەی پزیشکیی ڤێترینەری لە شاری لیۆن



## - خوێندنگەی پزیشکیی ڤێتریینەری لە شاری لیۆن :



شاری لیۆن لە وڵاتی فەرەنسا بە شوێنی لەدایکبوونی یەکەمین خوێندنگەی ئەکادیمی دادەنرێت لە جیهاندا لە بواری پزیشکیی ڤێتریینەری لە ساڵی ١٧٦١ز لەسەر دەستی Claude Bourgelat زانای گەورەی سەردەمی ڕۆشنگەری لە سەدەی هەژدەیەمدا هاتە دامەزراندن .



بیرۆکەی دامەزراندنی خوێندنگەی پزیشکیی ڤێتریینەری لە شاری لیۆن زیاتر دەگەڕێتەوە بۆ ئەو زەمینە مێژوویی یەی کە ڕۆژگاری ڕۆشنگەری هێنایە کایەوە ئەوەبوو لە سەردەمی دەسەڵاتی لویسی پازدەیەم و لە چوارچێوەی پیادەکردنی سیاسیەتی ڕیفۆرم لە وڵاتدا و هەروەها بەهۆی بڵاوبوونەوەی نەخۆشی دەردەگا Cattle plague لەنێو ڕەشەوڵاخدا کە زەرەروو

زیانێکی گەورەی بە سامانی ئاژەڵ گەیاندبوو، لەبەرئەوە پێشنیاری ئەوەکرا کە پێویستە خوێندنگەیەکی ئەکادیمی لە بواری پزیشکیی ڤێتریـنـەری دابمـەزرێت و زانسـتەکانی پزیشـکیی ڤێتریـنـەری تێیـدا بخوێنرێت بە مەبەستی دۆزینـەوەی چارەسـەری نویٚ بۆ نەخۆشی دەردەگـاو نەخۆشـییەکانی دیکـەی ئـاژەڵان و هـەروەها پاراسـتنی لــــەوەڕگاکان و ڕاهێنــــانی جوتیاران و خاوەن ئاژەڵەکان لە بــــارەی بــــەخێوکردن و بـەڕێوەبردنی ئاژەڵـەکانیان بـە شـێوەیەکی زانسـتیانەو لــە ئەنجامدا پەرەسەندنی ئابوری وڵات، بیٚ گومان Claude Bourgelat ئـەو کەسـایەتیە گونجـاوە بـوو کـە بـە فـەرمی پۆسـتی بەڕێوەبـەری خوێندنگەکـەی لـە شـاری لیۆن پێسـپێراو بـوو بـە سەرپەرشـتیاری گشـتی گشـت ئـەو خوێندنگـە هاوشـێوانەی دیکـە لـە شـارەکانی ئەلفۆرت و پاریس و هەروەها سەرپەرشتی کێڵگەکانی بەخێوکردنی ئەسپی شاهانەی وڵاتی فەرەنسای دەکرد.



بـە گـوێرەی سەرچـاوەکان لـە بـەرواری ١٧٦١/٨/٥ز و بـەپێی فـەرمانێکی ئەنجومـەنی شـاهانە Claude Bourgelat هەسـتا بـە کردنەوەی خوێندنگەی پزیشکیی ڤێتریـنـەری لـە شاری لیۆن وەکو یەکەمین خوێندنگەی پزیشکیی ڤێترینەری لە جیهاندا کە بووە هۆی لەدایکبوونی پیشەی پزیشکیی ڤێترینەری.

له ساڵی ١٧٦٢ز یەکەمین دەستەی خوێندکاران کە ژمارەیان سی و هەشت خوێندکار بوون وەرگیران و لە هەمان ساڵدا خوێندکارە وەرگیراوەکان دەستیان کرد بە خوێندن لە یەکەمین کۆلێجی پزیشکیی ڤێترینەری لە جیهانداو لە ساڵی ١٧٦٤ز ناوی خوێندنگەکەیان گۆڕی بۆ خوێندنگەی پزیشکیی ڤێترینەری شاهانە (Royal Veterinary School)، دوای ماوەیەك جارێکی دیکە ناوەکەیان گۆڕی بۆ خوێندنگەی پزیشکیی ڤێترینەری نیشتمانی(National Veterinary School) بە پێی سەرچاوە مێژوویییەکان مەنهەجی خوێندنەکەیان لە خوێندنگەکە زیاتر پێکهاتبون لەو پەرتوکانەی کە لەلایەن Claude Bourgelat دانرابوون و بڵاوکرابوونەوە، لەبەر ئەوە خوێندکاران زۆر بایەخیان پێدەداو کەڵکیان لێوەردەگرت لە زانستەکانی پزیشکیی ڤێترینەری و هەروەها خوێندکاران بە شێوەیەکی پراکتیکی وانەکانیان دەخوێند بەوەی بە دەستی خۆیان کاریان دەکرد لە ژێر سەرپەرشتی مامۆستاکانیان و لەو سەردەمشدا زۆر گرنگیان دەدا بە نەخۆشییەکانی وڵاخە یەکسمەکان و هەروەها کاری ناڵبەندی لە ئەسپ و مایندا.

لەدوای دامەزراندن و وەرگرتنی خوێندکارانەوە لە خوێندنگە کە Claude Bourgelat زۆر گرنگی دەدا بە لایەنی پەروەردەکردنی خوێندکاران و ئاراستەکردنیان لە چوارچێوەی رەفتاری پیشەیی باڵادا بە مەبەستی ئەوەی لەدواڕۆژدا پزیشکێکی پەروەردەکراو و شارەزاو رەفتار جوان و راستگۆیان لێدەربچێت و لە ئەنجامدا وڵات

کـەڵکیان لێوەربگرێـت، لەبەرئـەوە دەتـوانین بڵـێین کـە Claude Bourgelat بە ڕابەری پزیشکانی ڤێترینـەری دادەنرێت لە جیهانـدا لـە ڕووی ڕەفتـارو زانسـت و فەلسـەفەوە . Claude Bourgelat فەلسـەفەی کـارکردنی خـۆی لـە چوارچـێوەی بڵاوکراوەیەکـدا ڕوون کردۆتـەوە بـە نـاوی یاسـاکانی خوێندنگـەی پزیشـکیی ڤێترینـەری شـاهانە کـەوا پـێش دوو سـاڵ لـە کۆچـکردنی چاپکراوە لـە سـاڵی ١٧٧٧ز دا ، بەم شێوازە باسی فەلسەفەی خۆی دەکات:

"دەرگاکانی خوێندنگەکەمان کراوەیە بۆ هـەموو ئـەو کەسانەی لـە هەوڵی ئەوەدان کە مرۆڤایەتی بپارێزن ، بێ گومان ئەو کەسانەن کە مـافی ئـەوەیان هەیـە بچنە نێـو سروشـتەوەو بگـەڕێن بە دوای خاڵـە لەیەکچـــووەکانداو بیروبۆچـــونەکان تاقیبکەنـــەوەو ڕاســـتیەکان بسەلمێنن، ئەمەش بێگومان لە قازانجی مرۆڤایەتیدا دەبێت".

ســـــەبارەت بـــــە پەیوەنـــــدی لـــــەنێوان مرۆڤـــــ و ئاژەڵـــــدا Claude Bourgelat بـەم شـێوەیە گوزارشـت لـە فەلسـەفەی خـۆی دەکات و دەڵێت:

"ئێمـە لـەو بڕوایـەداین کـە پەیوەندیـەکی بـەهێز هەیـە لـە نێـوان جەستەی مرۆڤ و جەستەی ئاژەڵدا، ئەم پەیوەندییەش بێ گومان لە ڕێـی زانسـتی پزیشـکیەوە زیـاتر ڕۆشـن دەبێتـەوەو لـە ئەنجامـدا یـەکتری تـەواو دەکـەن کاتێـك دوور دەکەوینـەوە لـە بیروبۆچـوونە زیانبـەخش و دەمارگیریـەکان، لەبەرئـەوە چـیتر لـەوە ناترسـین کـە لێکۆڵینەوە لە سروشتی ئاژەڵەکان بکەین".



نـــــاو و ناویــــــانگی خوێندنگـــەکانی پزیشـــکیی ڤێترینەری لە شارەکانی لیۆن و ئـــەلفۆرت زۆر بڵاویـــۆوە بـــە وڵاتانی ئەوروپادا بە شێوەیەك بووە هۆی ڕاکێشانی خوێندکاران لە گشت وڵاتانی ئەوروپاوەو لە دوایشدا ئەوان بوون بە پێشەنگی پیشەی پزیشکیی ڤێترینەری لە وڵاتـەکانی خۆیـان و بـۆ هـەموو جیهـان دەرکـەوت کـە پیشـەی پزیشکیی ڤێترینەری و پێشکەشکردنی خزمەتگوزاری ڤێترینەری بە کۆمەڵگە بووەتە پێویستیەك لە پێویستیەکانی سەردەمەکەو ئەمەش بووە هۆی دامەزراندنی ژمارەیەکی زیاتر لە کۆلێجەکانی پزیشکیی ڤێترینـەری لـە وڵاتـانی ئەوروپادا بە شێوەیەك تا کۆتـایی سـەدەی هەژدەیەم پازدە خوێندنگەی دیکە لە بواری پزیشکیی ڤێترینـەری دامەزران لەوانەش کۆلێجی پزیشکیی ڤێترینەری لە لەندەن لە ساڵی ١٧٩١ز و لە ساڵی ١٧٩٨ز کۆلێجی پزیشکیی ڤێترینەری لە ناپۆلی لە وڵاتی ئیتاڵیا کرایەوە، بەم شێوەیەو لەبەر ڕۆشنایی فەلسـەفەی Claude Bourgelat سـاڵ لـەدوای سـاڵ بیرۆکـەی کردنـەوەی کۆلێجـەکانی پزیشـکیی ڤێترینـەری و خوێنـدنی زانسـتەکانی پزیشکیی ڤێترینەری گشت وڵاتانی جیهانی گرتەوەو وایلێهات کە وەك پێویسـتیەك لـە پێویسـیتەکانی سـەردەم تەماشـا دەکـراو پزیشکانی ڤێترینـەری وەکو ئەندامێکی بەکەڵکی کۆمـەڵگاکان بونە خاوەن پێگەیەکی دیارو سەنگین ئەمەش بەهۆی ئەو چالاکییە جۆر

بە جۆرانەو سود بەخشانەوە کە پێشکەشی خەڵکیان دەکرد لە پاراستنی تەندروستی گشتی و پاراستنی تەندروستی ئاژەڵ و باڵندەکان و پارێزگاریکردن لە پاك و خاوێنی ژینگەو دابینکردنی ئاسایشی خۆراك کە بێگومان هەموو ئەمانەش دەبنە هۆی پارێزگاریکردن لە مرۆڤایەتی.

# پیشەی پزیشکیی ڤێترینەری
# لە عێراق و کوردستان



## - پیشەی پزیشکیی ڤێترینەری لە عێراق و کوردستان :

کۆمەڵگای عێراقی لە سەردەمی ژێر دەسەڵاتی عوسمانیەکان لە ڕووی شارستانییەوە زۆر لە دواوە بووە بە شێوەیەك زانای بەناوبانگی کۆمەڵناسی عێراقی دکتۆر عەلی الوردی دەڵێت نەخۆشی و نەخوێندەواری و گەندەڵی و دواکەوتن توشی هەموو جومگەکانی کۆمەڵگای عێراقی بوو بوو کە ئەمەش بە گرنگترین دەسکەوتەکانی دەسەڵاتدارانی عوسمانیەکان دادەنرێت لە عێراقدا، بێگومان ئەم دواکەوتنەش لە خزمەتی سیاسەتی ئەواندا بووە، لەبەرئەوە پیشەی پزیشکیی ڤێترینەری وەکو هەموو پیشەکانی دیکە هیچ بایەخێکی ئەوتۆی نەبووەو هیچ خزمەتگوزارییەکی ڤێترینەری بونی نەبووە.

لەدوای سەرکەوتنی هاوپەیمانان بە سەرکردایەتی بەریتانیا لە جەنگی جیهانی یەکەم لە ساڵی ١٩١٨ز و گەیشتنی سوپای بەریتانیا بۆ ناو خاکی عێراق بە سەردەمێکی دیکە دادەنرێت لە مێژووی عێراق.

بە گوێرەی پەرتوکی مُعجُم العراق (عبدالرزاق الهلالي ، ١٩٥٣) لە ساڵی ١٩١٨ز ئینگلیز لە عێراقدا دەستیان کرد بە دامەزراندنی فەرمانگەی ڤێترینەری بە ناوی (دائرة البيطرة و الركائب الملكية) کە یەکەمین بەڕێوەبەری مێجەر ( س.آر.جادویك) ئینگلیز بوو ، لەبەر نەبونی هیچ پسپۆڕێکی عێراقی بە هاوکاری پسپۆڕە هندیەکان کاروباری ڤێترینەریان ئەنجام دەداو یەکەمین کاری ئەم فەرمانگەیە بریتیبوو لە دروست کردنی نەخۆشخانەیەکی

ڤێترینەری لە شاری بەغداو کردنەوەی تاقیگەیەکی ڤێترینەری و هەروەها دامەزراندنی چەند پەیمانگایەکی ڤێترینەری لە چەند شارێکی دیکەی عێراق کە توانیان چەند کەسێك ئاشنا بکەن بە ئیش و کاری هونەری ڤێترینەری لەو ماوەیەدا.



لە ساڵی ١٩٢٠ز و لەبەر نەبوونی بودجەی پێویست تەنها یەك خوێندکار ڕەوانەی قوتابخانەی بەنگالی وڵاتی هیندستان کرا بۆ تەواوکردنی خوێندن لە بواری پزیشکیی ڤێترینەری و کردنەوەی چەندەها خولی ڕاهێنان و مەشق کردن لە نەخۆشخانەی ڤێترینەری ناوەندی لە بەغدا لە ژێر سەرپەرشتی پزیشکە ڤێترینەرییە هیندییەکان و ئەوانەی لەو خولانەدا سەرکەوتووبوون بە ناونیشانی یاریدەدەرانی پزیشکیی ڤێترینەری و برین پێچی ڤێترینەری دانەمەزران. لەدوای ساڵی ١٩٢٠ز لێپرسراوان لە عێراقدا هەستیان بەوە کرد کە وڵات پێویستی بە ژمارەیەکی گونجاو هەیە لە پزیشکانی ڤێترینەری لەبەرئەوە ژمارەیەکی باش لە خوێندکاران ڕەوانەکران بۆ کۆلێجەکانی پزیشکیی ڤێترینەری لە وڵاتی هیندستان و میسر بە مەبەستی تەواوکردنی خوێندنەکەیان و لە دوای گەڕانەوەیان وەکو پزیشکانی ڤێترینەری کاروباری ڤێترینەری لە وڵاتدا بگرنە ئەستۆ لە جیاتی پزیشکە بیانییەکان، بەم شێوەیە

هەتاكو ساڵی ١٩٥١ز ژمارەیان بوو بە بیست و سێ پزیشكیی ڤێترینەری كە هەندێكیان بڕوانامەی دكتۆرایان لە زانستەكانی پزیشكیی ڤێترینەریدا وەرگرت.




لە سەردەمی پاشایەتیدا لە عێراق ناوی فەرمانگەی (دائرة البيطرة والركائب الملكية) گۆڕا بۆ بەڕێوەبەرایەتی گشتی ڤێترینەری (مديرية البيطرة العامة) وە بە وەزارەتی ئابوری وە بەستراو لەم ماوەیەداو لە ئەنجامی ئەم هەنگاوە کرداریانەدا سامانی ئاژەڵ لە عێراقدا وەکو سامانێکی نیشتمانی پەرەسەندنێکی لەبەرچاوی بەخۆوە بینی ئەمەش بێگومان بەهۆی بایەخدانی حکومەتی عێراقی بە پاراستنی تەندروستی سامانی ئاژەڵ لە چوارچێوەی دەستنیشانکردن و چارەسەرکردنی نەخۆشییەکان و هەروەها پشکنینیان بە شێوازێکی زانستیانەو لە دواییدا وەزارەتی ئابوری عێراق بودجەیەکی باشی تەرخانکرد بۆ دامەزراندنی دەزگا تەندروستیە ڤێترینەرییەکان لە گشت شارەکانی عێراق بە کوردستانەوە بە شێوەیەك کە یەکەمین نەخۆشخانەی ڤێترینەری لە شاری سلێمانی لە ساڵی ١٩٣٦ز لە گەڕەکی سابون کەران کرایەوەو لە هەمان ساڵیشدا لە شاری هەولێر کرایەوەو لە ساڵی ١٩٣٧ز لە شاری کەرکوك لە گەڕەکی ئیمام قاسم کرایەوە.

بە پێی ( عبدالرزاق الهلالي ، ١٩٥٣) ژمارەی نەخۆشخانەکانی پزیشکیی ڤێتریننەری تاکو ساڵی ١٩٥١ز لە عێراقدا گەیشتە پازدە نەخۆشخانە بەم شێوەیە :

لە بەغدا (دوو نەخۆشخانە) ، موسل - کەرکوک - سلێمانی - هەولێر - خانەقین - رومادی - بەسرە - دیوانیة - کەربەلا - حلة - عمارة - کوت - منتفك[8]، هەروەها ژمارەی هۆبەکانی ڤێتریننەری لە شارو شارۆچکەکانی عێراق تا ساڵی ١٩٥١ز گەیشتە چل هۆبە کە بەم شێوەیە دابەشبوون :

پێنجوێن - پشدەر - چەم چەماڵ - مەندەلی - قەرەتوو - شنگال - ئاکرێ - دهۆك - کفری - هەڵەبجە - کۆیە - زاخۆ - رەواندووز - مەخمور - شارباژێڕ - رانیە - ئاسکی کەلەك - ئاڵتون کۆپری - دووز خورماتوو - سامرا - الجبایش - العمارة - تلعفر- الدغارة - قلعة صالح - بعقوبة - الخالص - الفلوجة - عنة - ابو الخصیب - الشطرة - بدرة - النجف - علي الغربي - الصویرة - الزبیر - القرنة - سوق الشیوخ - قلعة سكر - المسیب.



بەم شێوەیەی سەرەوە بۆمان دەردەکەوێت کە هەتاکو ساڵەکانی ١٩٥١ز لە بیست و سێ شارۆچکەی کوردستان نەخۆشخانەکانی ڤێتریننەری و هۆبەکانی ڤێتریننەری کراونەتەوە واتە بە رێژەی

(٤١.٨٪) و له سی و دوو شارو شارۆچکەی دیکەی عێراق بە ڕێژەی (٥٨.١٪) نەخۆشخانەکان و هۆبەکان کراونەتەوە، ئەمەش بێگومان چەند ڕاستیەك دەردەخەن :

١. لەبەر ئەوەی ناوچەکانی کوردستان لە ڕووی زانستیەوە ژینگەیەکی زۆر لەبارترە بۆ بەخێوکردنی ئاژەڵە جۆربەجۆرەکان بە بەراورد بە ناوچەکانی دیکەی عێراق، لەبەر بوونی سروشتێکی جوان و کەش و هەوایەکی لەبارو خاکێکی بەپیت و لەوەڕگایەکی زۆرو بوونی گەلێك سەرچاوەی ئاو لە کانی و کانیاو و ڕووبارەکان.

٢. پزیشکان و کارمەندانی ڤێترینەری لە نەخۆشخانەکان و هۆبەکانی شارو شارۆچکەکانی کوردستان چالاکانە خزمەتگوزاریەکانی ڤێترینەری بە خاوەن ئاژەڵەکان پێشکەش دەکەن لە کوتانی ئاژەڵە ساغەکان و چارەسەرکردنی ئاژەڵە نەخۆشەکان .

٣. دەرکەوتنی خاوەن ئاژەڵی شارەزاو لێهاتوو لە ناوچە جیاجیاکانی کوردستان کە ساڵانێکی زۆرە بە کاری ئاژەڵدارییەوە خەریکن و لە ئەنجامی کارکردنی ڕۆژانەدا لەگەڵ ئاژەڵەکانیان زانیاریەکی باشیان کۆکردۆتەوە سەبارەت بە خەسڵەتە جیاجیاکانیان ئەمەش بێگومان بۆتە هۆی زۆربون و گەشەکردنی سامانی ئاژەڵ بە شێوەیەکی گشتی.

٤. ئاستی هۆشیاریی پزیشکیی ڤێترینەری و هۆشیاریی بەخێوکردن و بەڕێوەبردن و زۆربونی ئاژەڵەکان لەنێو کۆمەڵگای

کوردستان زیاتره وەك لە ناوچەکانی دیکەی عێراق ئەمەش بێگومان بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە هەر لە مێژەوە پیشەیەکی سەرەکی خەڵکی کوردستان بووە.

پیشەی پزیشکیی ڤێتێرینەری ساڵ لە دوای ساڵ لە عێراقدا بەرەو پێشەوە هەنگاوی دەناو چوارچێوەی خزمەتگوزاریەکانی ڤێتێرینەری لە ڕێی نەخۆشخانەکانەوە فراوانتر دەبوو بەوەی دەگەیشتە دوورترین شوێنی ولآت و لە ئەنجامدا سامانی ئاژەڵ لەمەڕو مالآت و ڕەشەولآخ و ووشتر و ولآخەبەرزە لە زۆربون و پەرەسەندندا بوو، بە گوێرەی ئامارەکانی ساڵی ١٩٥٣ز ئامارە بەوە دەکات کە سالآنە لە عێراقدا چوار ملیۆن سەر ئاژەڵی جۆراو جۆر سەردەبڕا بۆ پڕکردنەوەی پێداویستیەکانی ناوخۆی ولآت و هەروەها لە کۆی کەلوپەلە هەناردەکراوەکان بۆ دەرەوەی ولآت بە ڕێژەی (١١.٣٪) لە ڕەشەولآخ و بەرووبومەکانی بووە.

(عبدالرزاق الهلالي ، ١٩٥٢) ئاماژە بەوە دەکات بەوەی ٦٠٪ی دانیشتوانی عێراق بە کاری کشتوکاڵی و بەخێوکردنی جۆرێک یان زیاتر لە ئاژەڵە ماڵییەکانەوە خەریکن و جۆرەکانی ئاژەڵیش ئەمانە بوون :–

<u>یەکەم</u> / مەڕ : سێ جۆر بوون :–

١. مەڕی کوردی کە لە ناوچەکانی کوردستاندا بەخێو دەکران .
٢. مەڕی عەواسی لە ناوچەکانی باکورو ڕۆژئاوالو ناوەندی عێراق بەخێو دەکران.
٣. مەڕی عەرابی و پێشی دەوترێت ( الشفالي ) کە لە دەشتاییەکانی خوارووی عێراق بەخێو دەکرا.



دووەم/ بزن : بە شێوەیەکی گشتی لە ناوچەکانی کوردستاندا بەخێو دەکران و دوو جۆری هەیە:-

١. بزنی ئاسایی : بە هەموو ناوچەکانی وڵاتدا بڵاوبۆتەوە .
٢. بزنی مەرەز : تەنها لە کوردستاندا بەخێو دەکرێن .

سێیەم/ مانگا : دوو جۆری هەیە

١. مانگاکانی ناوچەکانی خوارووی عێراق .
٢. مانگاکانی ناوچەکانی کوردستان .



چـــوارەم / گـامێش : زیـاتر بـەخێو دەکرێـت لـە دەشـتاییەکان و خوارووی عێراق لە ناوچە زەلکاویەکان.

**پێنجەم/** ئەسپ و ماین : دوو جۆری هەیە
١. ئەسپی ڕەسەنی کوردی لە ناوچە کوردستانیەکان بەخێو دەکرێت.
٢. ئەسپی عەرەبی لە بەشەکانی دیکەی عێراق بەخێو دەکرێن.

**شەشەم/** ووشتر : لە ناوچەکانی باکوری ڕۆژئاواو خواروی عێراق بەخێودەکرێن .

**حەوتەم/** هێستر : لە ناوچە شاخاویەکانی کوردستانی کوردستان بەخێو دەکرێن.

**هەشتەم/** گوێ درێژ : لە زۆربەی ناوچەکانی عێراق بەخێو دەکرێن.
وە بە پێی ئاماری فەرمی سالّی ١٩٤٩ – ١٩٥٠ز ژمارەی ئاژەلّەکان لە عێراقدا بەم شێوەیە بووە:

- مەڕ : ٧.٠٥٥.٠٠٠ ملیۆن سەر .
- بزن : ١.٨٤٩.٠٠٠ ملیۆن سەر .
- مانگا : ٨٢٢.٠٠٠ هەزار سەر.
- گامێش : ١٣٠.٠٠٠ هەزار سەر.
- ووشتر : ٢٩١.٠٠٠ هەزار سەر.
- ئەسپ : ١٨٨.٠٠٠ هەزار سەر.
- هێستر : ٥٢.٠٠٠ هەزار سەر.
- گوێ درێژ : ٤١٣.٠٠٠ هەزار سەر.



ئەم ژمارانە ئاماژەن بەوەی خزمەتگوزارییە ڤێترینەرییەکان کە لەلایەن پزیشکان و کارمەندانی ڤێترینەری وە پێشکەش دەکران ئەنجامی ئەرێنی هەبووە، لەبەرئەوە تا دەهات بەخێوکردن و بەرهەم هێنانی مەڕومالات و ڕەشەوڵاخ و پەلەوەر پەرەیان دەسەندو خاوەن زەوییەکان زەوییەکانیان دەکردە لەوەڕگای فراوان و لە بەرامبەر ئەمەشدا بێگومان دام و دەزگا ڤێترینەرییەکان لە نەخۆشخانەکان و تاقیگەکان و کوشتارگەکان و دەرمانخانەکان لە ڕووی چەندایەتی و چۆنایەتیەوە گەشەیان دەکردو لە ئەنجامدا وا پێویستی کرد کە ولات بچێتە قۆناغێکی پێشکەوتووترەوە لە بواری پیشەی پزیشکیی ڤێترینەری ئەویش بە کردنەوەی کۆلێجێکی تایبەت لە پسپۆڕی پزیشکیی ڤێترینەری بۆ ئەوەی ژمارەیەکی زیاتر لە پزیشکانی ڤێترینەری بێنە مەیدانەوەو پێداویستیەکانی نەخۆشخانەکان و تاقیگەکان و دەرمانخانەکانی ڤێترینەری پڕبکەنەوە ، لەبەرئەوە بۆ یەکەمین جار لە عێراقدا لە شاری بەغداو لە ساڵی ١٩٥٥ز کۆلێجی پزیشکیی ڤێترینەری دەرگاکانی کرایەوەو ئامادەکرا بۆ وەرگرتنی خوێندکاران.

# کۆلێجی پزیشکیی ڤێترینەری
# لە شاری بەغدا



## - کۆلێجی پزیشکیی ڤێترینەری لە شاری بەغدا :

بە پێی سەرچاوەکانی دەزگاکانی خوێندنی باڵا لە عێراق کۆلێجی پزیشکیی ڤێترینەری بۆ یەکەمین جار لە ساڵی ١٩٥٥ز لە شاری بەغدا کرایەوە وەکو یەکەمین دەزگای ئەکادیمی لە بواری پزیشکیی ڤێترینەری لە عێراق و شوێنەکەی دەکەوتە ناوچەی




(بغداد الجديدة) و دوای ماوەیەك گوازرایەوە بۆ ( ثانوية الصناعات الميكانيكية الألمانية) شوێنی ئێستای زانکۆی تەکنەلۆژیاو جارێکی دیکە گوازرایەوە بۆ پەیمانگای کشتوکاڵی لە شارۆچکەی ئەبوغرێب و لە کۆتایشدا لە ساڵی ١٩٧٠ز بەدواوە بینایەکی تایبەتی بۆ دروستکرا لە ناوچەی (العامرية) و هەتاکو ئێستاش شوێنەکەی لەو بینایەدایە. یەکەمین ڕاگری کۆلێجی پزیشکیی ڤێترینەری لە بەغدا دکتۆر (سادق خەیات) بووەو دەستەی مامۆستایانی کۆلێجەکە لە سەرەتادا زۆربەیان لە هیندستان و میسرو تورکیاو ئەڵمانیا و یۆغسلافیاو پاکستان بانگهێشکرابون بۆ ووتنەوەی وانەکان کە بە زمانی ئینگلیزی دەوترایەوە لە هەر پێنج قۆناغەکەدا.

لە ساڵی خوێندنی (١٩٥٩ – ١٩٦٠) یەکەمین دەستەی دەرچووان کە ژمارەیان دوازدە خوێندکار بوون بڕوانامەی بکالۆریۆسیان وەرگرت لە پزیشکیی و نەشتەرگەری ڤێترینەری (B.V.M&S) کە زۆربەیان لەدواڕۆژدا بڕوانامەی دکتۆرایان

بەدەستهێناو بوون بە بنەمایەکی بەهێزی ئەکادیمی لە کۆلێجەکەدا بۆ پێگەیاندنی نەوەکانی داهاتوو، بە شێوەیەك تاکو ئەم سەردەمە وەکو مەڵبەندێکی زانستی و ئەکادیمی بەردەوامە لە پێشکەشکردنی پزیشکانی ڤێتریندەری بەدام و دەزگاکانی ڤێترینەری لە عێراق و هەروەها پێگەیاندنی پزیشکانی ڤێترینەری لە بواری خوێندنی باڵا ماستەرو دکتۆراو پێشکەشکردنیان بە دام و دەزگا ئەکادیمیەکانی وڵات.



کۆلێجی پزیشکیی ڤێترینەری لە زانکۆی بەغدا بووە ناوەندێکی زانستی بۆ ئەنجام دانی لێکۆڵینەوەی زانستی لە بوارە جۆراو جۆرەکانی پزیشکیی ڤێترینەری وەکو نەخۆشییەکانی پەلەوەرو نەخۆشییە مرۆڤەڵییەکان و نەخۆشییەکانی ماسی و نەخۆشییەکانی زاووێ و نەزۆکبوون و نەخۆشییەکانی هەناو، ڕێخۆشکەربوون بۆ دۆزینەوەی چارەسەری گونجاو بۆ زۆر لە کێشەکان کە بووە هۆی پاراستنی تەندروستی ئاژەڵ و پەرەسەندنیان و بەرزبونەوەی ئاستی ئابوری وڵات و پاراستنی تەندروستی گشتی، بەهۆی ئەو کارانە کۆلێجی پزیشکیی ڤێترینەری لە شاری بەغدا ناوبانگی ئەکادیمی و زانستی و پیشەیی بەرزی بەدەستهێنا لەسەر ئاستی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست ، ئەمەش هۆکارێکی سەرەکی بوو بۆ ئەوەی پیشەی پزیشکیی ڤێترینەری لە قۆناغێکەوە گواستەوە بۆ قۆناغێکی پێشکەوتووترو سەردەمێکی

نویَ بەوەی پیشەکە بەیەکێك لە پیشە سەرەکیەکانی کۆمەڵگای عێراق ئەژمار دەکراو پزیشکانی ڤێتریناری وەکو ئەندامێکی پێویست و سەرەکی کۆمەڵ بوون بە خاوەن پێگەو جێگەی خۆیان لەبەر ڕۆڵ و چالاکیەکانیان لە پێشکەشکردنی خزمەتگوزارییە ڤێترینەریەکان لە گشت شارو شارۆچکەکانی عێراق و ساڵ لە دوای ساڵیش لە شارەکانی دیکەی عێراق کۆلێجەکانی پزیشکیی ڤێتریناری دەکرانەوە، لە ساڵی ١٩٧٦ز لە زانکۆی موسڵ و لە شاری موسڵ کرایەوەو لەم سەردەمەدا لە زۆربەی شارەکانی عێراق کۆلێجی پزیشکیی ڤێتریناری دامەزراوەو خوێندکاران وەردەگرن.

# ڕاپەڕین
# سەردەمێکی نوێ



## - راپەڕین .... سەردەمێکی نوێ:

ڕاپەڕینی گەلی کورد لە ساڵی ١٩٩١ز بە سەردەمێکی نوێ لە قەڵەم دەدرێت لە مێژووی بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی نەتەوەی کورد و خەباتی کوردایەتیدا بە شێوەیەکی گشتی بەوەی ڕاپەڕین خاڵێکی وەرچەرخان بوو لە مێژووی هاوچەرخی گەلی کوردا کە بووە هۆی لەدایکبوونی ژیانێکی نوێ لە سەردەمێکی نوێدا ئەویش بە بوژانەوەی کوردەواری لە هەموو ڕوویەکەوەو دەتوانین بڵێین گواستنەوەی کوردەواری بوو لە قۆناغێکەوە بۆ ڕۆژگارێکی پێشکەوتوتر کە بووە هۆی گۆڕینی تێڕوانینی مرۆڤی کورد بەرامبەر ژیان و گشت ئەو مەسەلانەی پەیوەندی بە کۆمەڵگەی کوردی و کۆمەڵگەی مرۆڤایەتیەوە هەیە.

ڕاپەڕینە مێژووییەکەی ساڵی ١٩٩١ز بووە هۆی پێکهێنانی حکومەتی هەرێمی کوردستان و پەرلەمانی کوردستان و گەلێک هەنگاوی گەورەی دیکە لە بوارە جیاجیاکانی ژیانی کوردەواری، بەوەی ڕوخساری شارو شارۆچکەو گوندەکان



گۆڕانی بەسەردا هاتوو زۆربەی گوندەکانی کوردستان دووبارە ئاوەدانبوونەوەو گوندنشینەکان گەڕانەوە زێدی باو و باپیرانیان، بە شێوەیەکی لەبەرچاو شارو شارۆچکەکان فراوان بوون و ساڵ لە دوای ساڵیش ژمارەی دانیشتوانیان ڕوو لە زیادبوون بوو لەگەڵ ئەمەشدا بێگومان پێداویستیەکانی خەڵکی لە گشت ڕوویەکەوە ڕوو

لـە زیـادبوون دەچـوو بـە تایبـەتی پێداویسـتیە خۆراکیـەکان لـە بەروبومەکانی ئاژەڵ و باڵندە لە گۆشتی سوروسپی و هێلکە لەبەر ئەوە بەخێوکردنی مـەڕو مـاڵات و ڕەشـەوڵاخ و پەلـەوەر گەشـەیان کردو لەوەڕگاکان فراوان بوون.

لە کوردستانداو لـە ڕۆژگاری دوای ڕاپـەڕین وا پێویستی دەکرد کە یەکێك لە ستراتیجیەکانی حکومەتی هـەرێمی کوردسـتان دابینکردنـی ئاسایشـی خـۆراك بێـت لـە وڵاتـدا و بێگومـان ئەمـەش دێتـە دی بـەوەی تێـڕوانینی مرۆڤـی کـورد بەرامبـەر چـەمکی ئـاژەڵ و ئاژەڵـداری گـۆڕانی بەسـەردا بێـت بـەوەی ئـاژەڵ وەکـو



یەکەیـەکی ئـابوری سـەیری لێـوە بکرێـت و لـە چوارچـێوەیەکی فراوانتردا بەخێو بکرێن و ژمارەیـان زیـاد بکرێـت بە بـەکارهێنانی ڕێگەچارەی خێراو لە ڕێی تەکنەلۆجیای نوێوە بەوەی بەرهەم هێنان بخرێتـە چوارچـێوەی پیشەسـازییەوە وەکـو پیشەسـازی پەلـەوەرو پیشەسازی بەخێوکردنی مانگای شیرو گۆشت و پیشەسازیەکانی بەرهەم هێنانی ماست و پەنیر و کەرەو ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی چـالاکیە بازرگانیـەکانی کوردسـتان لەگـەڵ وڵاتـانی دراوسـێدا پەرەبسـێنێ لـە ڕێـی هۆکـارە جیاجیاکـانی گواسـتنەوەو بەمـەش ترسناکی گواستنەوەی نەخۆشییە جۆربە جۆرەکانی ئاژەڵ و باڵندە زیاتر دەبوو بۆ سەر تەندروستی ئاژەڵ و باڵندەکانی کوردستان و هـەروەها ترسناکی نەخۆشییە مرۆژەڵییـەکان (Zoonoses) ساڵ لە دوای ساڵ ڕوو لە زیـادبوون بوو بۆ سـەر تەندروستی هاوڵاتیان و ژینگـەی کوردسـتان، هـەروەك لـە دوای ڕاپەڕینـەوە گوێبیسـتی کۆمەڵێك لە نەخۆشییە مرۆژەڵییەکان بووین وەکو نەخۆشییەکانی

ئەنفلۆنزای باڵندەو ئەنفلۆنزای بەرازو تای خوێن بەربوون و پەتای ڤایرەسی کۆرۆنا و نەخۆشی سیل و تای ماڵتاو گەڕیی و دەردە پشیلە کە سەرچاوەی هۆکاری نەخۆشییەکان بریتیە لە یەکێك لە جۆرەکانی ئاژەڵەکان یان باڵندەکان، لەبەر ئەوە فەلسەفەی بیرکردنەوە لە بنبڕکردن و کۆنترۆڵکردنیان پێویستە لە ئاژەڵەکانەوە دەستپێبکەن چونکە تا تەندروستی ئاژەڵ و باڵندەکان پارێزراو نەبن تەندروستی مرۆڤ پارێزراو نابێت، لەبەر ئەوە کوردەواری لە دوای ڕۆژگاری ڕاپەڕینەوە زیاتر پێویستی بە خزمەتگوزاریەکانی پزیشکیی ڤێتیرینەری هەبووە لە ڕووی چەندایەتی و چۆنایەتیەوە، لەبەرئەوە پیشەی پزیشکیی ڤێتیرینەری بەرەو پێشەوە هەنگاوی نا لە ڕووی ئەکادیمی و خزمەتگوزاری و کاری سەندیکاییەوە کە خۆی دەبینێتەوە لە دامەزراندنی:-

١. کۆمەڵەی پزیشکانی دروستی ئاژەڵ/کوردستان وە لە دواییدا ناوەکەی گۆڕا بۆ سەندیکای پزیشکانی ڤێتیرینەری کوردستان.
٢. بەڕێوەبەرایەتی گشتی سامانی ئاژەڵ و ڤێتیرینەری ، کە بەڕێوەبەرایەتیەکی سەرەکیە لە وەزارەتی کشتوکاڵ و سەرچاوەکانی ئاو لە حکومەتی هەرێمی کوردستان.
٣. کۆلێجی پزیشکیی ڤێتیرینەری لە زانکۆی سلێمانی.
٤. کۆلێجی پزیشکیی ڤێتیرینەری لە زانکۆی دهۆك .
٥. پەیمانگای تەکنیکی ڤێتیرینەری لە کەلار .
٦. پەیمانگای تەکنیکی ڤێتیرینەری لە شەقڵاوە.
٧. کۆمەڵەی کارمەندانی ڤێتیرینەری / کوردستان .
٨. ڕێکخراوی خوێندکارانی پزیشکیی ڤێتیرینەری نێودەوڵەتی.
٩. کۆلێجی پزیشکیی ڤێتیرینەری لە زانکۆی کەرکوك.




# کۆلیژی پزیشکیی ڤێترینەری
# لە سلێمانی



## - کۆلێجی پزیشکیی ڤێتریینەری لە سلێمانی :

بیرۆکەی دامەزراندنی کۆلێجی پزیشکیی ڤێتریینەری لە زانکۆی سلێمانی و لە شاری سلێمانی دەگەڕێتەوە بۆ ئەو زەمینە مێژوویی یەی کە ڕۆژگاری ڕاپەڕین هێنایەکایەوە، ئەوەبوو بە گوێرەی بڕیاری سەرۆکایەتی ئەنجومەنی وەزیرانی هەرێمی کوردستانی عێراق/ خوێندنی باڵا ژمارە: ٨٦٨ لە ١٩٩٥/١٠/٧ و فەرمانی سەرۆکایەتی زانکۆی سولەیمانی ژمارە: ٢٣٩٢/١٠/٧ لە ١٩٩٥/١٠/١٠، کۆلێجی پزیشکیی ڤێتریینەری لە زانکۆی سلێمانی دامەزراو دەرگاکانی خستەسەر پشت وەکو یەکەمین کۆلێج لە پسپۆڕی پزیشکیی ڤێتریینەری لە هەرێمی کوردستانی عێراق.

لە سەرەتادا شوێنی کۆلێجەکە دەکەوتە بینای کۆلێجی ئەندازیاری لەنێو کەمپی ناوشاری زانکۆی سلێمانی وە لە دواییدا گوازرایەوە بۆ بینا سەرەکیەکەی کۆلێج کە تاکو ئێستاش لەو شوێنەیە.

یەکەمین ڕاگری کۆلێجەکە پرۆفیسۆر دکتۆر (جەلال مەجید شەریف)بوو کە بۆ ماوەی (١٠) ساڵێك مایەوە، ماوەی خوێندن لەم کۆلێجەدا پێنج ساڵ و چل و پێنج ڕۆژە ، لەبەرئەوەی خوێندکارانی قۆناغی چوارەم کە دەردەچن بۆ قۆناغی پێنجەم بۆ ماوەی چل و

پێنج ڕۆژ لە وەرزی هاوین دا مەشق و ڕاهێنان ئەنجام دەدەن لە نەخۆشخانەو هۆبەکانی ڤێتریندری لە شارو شارۆچکەکان لە ژێر سەرپەرشتی ڕاستەوخۆی پزیشکانی ڤێتریندری.

کۆلێجی پزیشکیی ڤێتریندری یەکێکە لە کۆلێجە پزیشکیەکانی زانکۆی سلێمانی لەبەرئەوەی زانستە پزیشکیەکان بەشێوەیەکی گشتی بۆ دوو کۆمەڵە دابەش دەکرێن ، یەکەمیان زانستە پزیشکیەکانی مرۆڤ و دووەمیان زانستە پزیشکیەکانی ڤێتریندری.

زمانی خوێندن لە کۆلێجی پزیشکیی ڤێتریندری بریتیە لە



زمانی ئینگلیزی لە گشت قۆناغەکانی خوێندنی بەرایی و خوێندنی باڵا. لە ساڵی (٢٠٠٠ – ٢٠٠١) یەکەمین دەستەی دەرچووان بڕوانامەی بەکالۆریۆسان لە پزیشکیی و نەشتەرگەری ڤێتریندری (B.V.M&S) دا وەرگرت.



کۆلێجی پزیشکیی ڤێتریندری لە ساڵەکانی سەرەتای دامەزراندنیدا بە تواناو ژمارەیەکی کەم لە مامۆستایان و فەرمانبەران دەستی بە کارە ئەکادیمی و کارگێڕیەکانی

کردو لەوانەش کە بە پێویستی دەزانم ناویان بهێنم (د.دێرین عمر محمد ڕەمزی و د.نەهلە محمد محمد سعید و د.ڕزگار ڕەحیم سلێمان و د.فریدون عەبدولستار محمد) کە پشکی شێریان بەرکەوتبوو لە ڕاییکردن و بەدواداچونی کارە زۆرەکانی کۆلێج کە بە شێوەیەك لەگەڵ ڕاگری کۆلێج وەکو یەك تیم کاریان دەکرد بەوەی زۆر دڵسۆزانەو بە باوەڕەوە هەنگاویان بەرەو دواڕۆژ دەنا چونکە وانەکانی مێژوو هەمیشە



پێمان دەڵێت هەموو پرۆژەیەکی گەورە لە هەنگاوێکەوە دەستپێدەکات. لە دواییدا ساڵ لە دوای ساڵ ژمارەی مامۆستایانی کۆلێجەکە زیادی دەکرد ئەمەش بەهۆی ئەوەی لە شارەکانی دیکەی عێراقەوە ڕوویان دەکردە کۆلێجەکەو لە کوردستان نیشتەجێ دەبوون کە ئەمەش لە بەرژەوەندی هەردوولا بوو، وە هەندێك لە مامۆستایان لە کۆلێجەکانی دیکەی زانکۆی سلێمانی و زانکۆکانی دیکەی هەرێمی کوردستان وانەیان لە کۆلێج دەوتەوە. سروشتی وانەکان لە کۆلێجی پزیشکیی ڤێتێرینەری دەکرێنە سێ جۆرەوە ، یەکەمیان وانە تیۆرییەکان کە لە هۆڵەکانی کۆلێج دا دەوترێتەوەو دووەمیان وانە پراکتیکیەکانە کە لە تاقیگەکاندا ئەنجام دەدرێت و سێیەمیان وانە کلینیکیەکانە کە لە نەخۆشخانەی پزیشکیی ڤێتێرینەری فێرکاری و هەروەها لە نەخۆشخانە و هۆبەکانی

ڤێتریینەری لە پیرەمەگروون و بازیان و عەربەت و سەید سادق کە سەر بە بەڕێوەبەرایەتی ڤێتریینەری سلێمانی یەو هەندێك جار خوێندکارەکان دەبرانە قەسابخانەو پرۆژەکانی بەخێوکردنی پەلەوەرو بەخێوکردنی ماسی و هەنگ لە ناوچەکانی نزیك ناوەندی شاری سلێمانی.



نەخۆشخانەی پزیشکیی ڤێتریینەری فێرکاری مەڵبەندێکی فێرکاریە سەر بە کۆلێجی پزیشکیی ڤێتریینەریە لە زانکۆی سلێمانی کەوتۆتە گەڕەکی شێخ محی الدین نزیك بەڕێوەبەرایەتی ڤێتریینەری سلێمانی. نەخۆشخانەکە ڕۆژانە خزمەتگوزاری ڤێتریینەری بە هەموو خاوەن ئاژەڵ و هاوڵاتیان بە گشتی پێشکەش دەکات بێ بەرامبەر بەوەی ئاژەڵە نەخۆشەکان دەهێنرێن بۆ نەخۆشخانەو لەلایەن مامۆستایانەوە بەپێی



پسپۆڕیان دەپشکنرێن بە بەکارهێنانی ئامێرە پزیشکیەکان و

نەخۆشـییەکان دەستنیشـان دەکـرێن و لـە ئەنجامـدا چارەسـەری گونجاویـان دەدرێـتێ و دەتـوانین بڵـێین کـە نەخۆشـخانەکە وەکـو مەڵبەنـدێکی ڕاوێـژکاری ڕۆڵـی گرنگـی هەیـە لـە پێـدانی ڕێنمـایی ڤێترینـەری و ئاراسـتەکردنی خـاوەن پرۆژەکـانی ئـاژەڵ و پەلـەوەرو ماسی بە شێوازێکی زانستیانە.

کۆلێجی پزیشکیی ڤێترینەری پێنج لقی زانستی لەخۆ گرتووە :-



١. لقـی زانسـتە بنچـینەییەکان . Department of Basic Sciences

٢. لقی توێکاری و نەخۆشیزانی . Department of Anatomy and Pathdogy

٣. لقی مایکرۆبایۆلۆژی. Department of Microbiology

٤. لقی نەشتەرگەری و نەخۆشییەکانی زاووزێ و نۆربوون . Department of Surgery and Theriogenology

٥. لقی کلینیك و نەخۆشییەکانی هەناوی Department of clinic and internal Medicine

ئەرکەکانی کۆلێج هەر لە ساڵەکانی سەرەتاوە کە پێویست بوو بە ئەنجامی بگەیەنێت بۆ ئەوەی کەم و کوڕیەکانی کۆلێج خۆی و دام و دەزگاکانی ڤێترینەری پڕبکاتەوە لە کۆمەڵگای کوردەواری بریتیبووە لە :



**یەکەم** / پێگەیاندن و دەرچواندنی ژمارەیەکی گونجاو لە پزیشکانی ڤێترینەری خاوەن زانستێکی باش و پێشکەشکردنیان بە دام و دەزگاکانی ڤێترینەری لە هەرێمی کوردستان بە مەبەستی پێشکەشکردن و گەیشتنی خزمەتگوزاری ڤێترینەری بە دوورترین شوێنە لە شارو شارۆچکەو گوندەکاندا.

**دووەم**/ پێگەیاندن و دەرچواندنی مامۆستایانی پسپۆڕ لە زانستەکانی پزیشکیی ڤێترینەری خاوەن بڕوانامەی باڵا (دبلۆمی باڵا – ماستەر – دکتۆرا)بە هاوکاری مامۆستایانی خاوەن نازناوی زانستی بەرز لە کۆلێجەکان یان زانکۆکانی دیکەی هەرێم یان عێراق بۆ پڕکردنەوەی کەم و کوڕیەکانی دەستەی مامۆستایان لەوانە جیاجیاکاندا.



**سێیەم**/ ئەنجامدانی توێژینەوەی زانستی لە بوارە جیاجیاکان و هەڵبژاردنی بابەتی توێژینەوەکان لە کەم و کوڕیەکانی کۆمەڵگا سەبارەت

بەو نەخۆشییانەی کە توشی ئاژەڵەکان دەبێت و هەروەها ئەو کێشانەی کە دەبنە هۆی پەکخستنی پرۆژەکانی بەخێوکردنی پەلەوەر و ماسی و هەوڵدان بۆ دۆزینەوەی چارەسەری گونجاو.

**چوارەم**/ کردنەوەی خولی زانستی و سازدانی کۆڕو کۆبوونەوەی زانستی بە مەبەستی بەرزکردنەوەی ئاستی زانستی پزیشکانی ڤێتیرنەری و کارمەندانی ڤێتیرنەری لە دام و دەزگاکانی ڤێتیرنەری ، هەروەها بەرزکردنەوەی ئاستی هۆشیاریی پزیشکیی ڤێتیرنەری لەنێو فەرمانبەرانی دام و دەزگاکانی حکومەتی هەرێم بە گشتی.



**پێنجەم** / بڵاوکردنەوەی هۆشیاریی پزیشکیی ڤێتیرنەری لە نێو توێژە جیاجیاکانی کۆمەڵی کوردەواری ئەمەش لەبەر ئەوەی هۆشیاریی پزیشکیی ڤێتیرنەری بووەتە پێویستیەك لە پێویستیەکانی سەردەم.



سەرەڕای کێشە زۆرەکان و ئاستەنگەکانی ڕۆژگار دەرەنجام ئەتوانین بڵێین لە یادی تێپەڕبوونی یۆبیلی زیوینی کۆلێجی پزیشکیی ڤێتێرینەری واتە لە یادی بیست و پێنجەمین ساڵەی بنیاتنانی ڕێگایەکی نوێی لە ژیانی کوردەواری ڕۆشن کردەوەو کۆلێجی پزیشکیی ڤێتێرینەری بووە وێستگەیەکی مێژوویی گرنگ لە مێژووی پیشەی پزیشکیی ڤێتێرینەری لە کوردستان بەوەی کۆمەڵێك دەسکەوتی پیشەیی و ئەکادیمی و فەرهەنگی و کۆمەڵایەتی پڕ بایەخی بەدەستهێناوە بۆ کوردەواری کە بێگومان کاریگەری ئەرێنی هەیە لەسەر ژیانی توێژە جیاجیاکانی کۆمەڵ بە شێوەیەك کە گەشەو پێشکەوتنی کۆمەڵ و گۆرانکارییە بابەتی و مێژووییەکانی پیشەی پزیشکیی ڤێتێرینەری لە قۆناغێکەوە بۆ قۆناغێکی بالاترو گەشترو پێشکەوتوتر ئاراستەکرد.

لەبەرئەوە دەتوانین بڵێین دەستکەوتەکانی کۆلێجەکانی پزیشکیی ڤێتێرینەری لە کوردستان بەم شێوەیەیە :-



١. لەم سەردەمەدا پزیشکانی ڤێتێرینەری لەنێو کۆمەڵی کوردەواری پێگەیەکی کۆمەلایەتی بالایان هەیە بەوەی کە ئەندامێکی بەکەڵکن و دەوروبەریان ڕووناك کردۆتەوە کە ئەمەش وایکردووە کەسایەتیان بەهێزبێت و

بەرێزو خۆشەویستیەوە سەیریان بکرێن ئەمەش بێگومان لە ئەنجامی کارەکانیان و چالاکیە سودبەخشە جۆر بە جۆرەکانیان لە کۆمەڵ، لەبەر ئەمە ئێستا پیشەی پزیشکیی ڤێتریندەری بە یەکێك لە پیشە باڵاکانی کۆمەڵی کوردەواری دادەنرێت و توێژە جیاجیاکانی کۆمەڵیش بە گشتی خوێندنەوەیەکی نوێ و سەردەمیانەیان هەیە بۆ ڕۆڵی پزیشکانی ڤێتریندەری.



٢. بڵاوبونەوەی هۆشیاریی پزیشکیی ڤێتریندەری لەنێو توێژەکانی کۆمەڵ گەشەی کردووەو هۆشیاریی سەبارەت بە نەخۆشییەکانی ئاژەڵ و باڵندەو ماسی و هەروەها گواستنەوەی هەندێك لە نەخۆشییەکان بۆ مرۆڤ و چۆنیەتی خۆپارێزی لێیان بووەتە پێویستیەك لە پێداویستیەکانی ژیان، بە شێوەیەك هاوڵاتیانی کوردستان لە شارو گوندەکاندا زۆر گرنگی دەدەن بە زانیاری نوێ لە بارەی چۆنیەتی بەخێوکردنی ئاژەڵەکانیان و بە بەردەوامی سەردانی پزیشکانی ڤێتریندەری دەکەن بۆ وەرگرتنی ڕێنمایی پێویست و بەم شێوەیە ئاستی ڕۆشنبیری خۆیان بەرزدەکەنەوە.

٣. بە کۆتایی هاتنی ساڵی خوێندنی (٢٠١٩-٢٠٢٠) کۆلێجی




پزیشکیی ڤێتریینەری لە زانکۆی سلێمانی بیستەیەمین خولی دەرچووانی لە پزیشکانی ڤێتریینەری پێشکەش بە دام و دەزگاکانی حکومەتی هەرێمی کوردستان دەکات و دەرچووانی ئەم کۆلێجە ڕۆڵی لەبەرچاویان هەبووە لە بەرزکردنەوەی ئاستی خزمەتگوزاریەکانی ڤێتریینەری لە هەردوو کەرتی گشتی و کەرتی تایبەت بەوەی بە بیری نوێ و زانستی نوێ ڕێگاکانیان ڕۆشن کردەوەو کارەکانیان ئەنجام دەدا لە دەزگاکانی ڤێتریینەری لە نەخۆشخانەکان و هۆبەکان و قەسابخانەکان و تاقیگەکان و کەرانتینەکانی سەر سنورەکان و فرۆکەخانەکان و هەروەها لە کلینیکە تایبەتەکان و کۆمپانیاکان بە شێوەیەك سەردەمیانە سەرکردایەتی چالاکیەکانیان دەکرد کە لە ڕووی چۆنایەتیەوە گۆڕانکاری دیاریان ئەنجام داوە بێ گومان ئەمەش بە سود وەرگرتن لە شارەزایی و کارامەیی پزیشکانی

ڤێترینەری نەوەکانی پێش خۆیان ، هەندێکیان لە دەزگاکانی ڤێترینەری ولاتە پێشکەوتووەکانی جیهان توانیویانە خۆیان بە زانستی نوێ پەروەردە بکەن و وەکو پزیشکێکی



ڤێترینەری سەرکەوتوو پلەکانی پێشەوە بەدەستبهێنن لەوانەش دکتۆر (شوان کەریم سالّح) کە لە دەرچوانی خولی یەکەمی کۆلێجەکەیەو لە سالّی ۲۰۱۸ز بە پزیشکیی ڤێترینەری سالّ لە ولاتی سوید دەستنیشانکرا لە پای چالاکیە زانستی و پیشییەکانی لە بواری پشکنینی گۆشت لەو ولاتەدا.

٤. لە دەستکەوتە ناوازەکانی کۆلێجەکانی پزیشکیی ڤێترینەری لە کوردستان بە شێوەیەکی گشتی بریتیە لە بەرهەم هێنانی دەستەیەکی ئەکادیمی لە پزیشکانی ڤێترینەری خاوەن بڕوانامەی بالا لە ماستەرو دکتۆرا لە پسپۆریەکانی زانستەکانی پزیشکیی ڤێترینەری



لە رێی کردنەوەی پرۆسەی خوێندنی بالا لە کۆلێجەکان بە پالّپشتی مامۆستا پسپۆرەکانی کۆلێجەکانی دیکەی زانکۆ و هەروەها زانکۆکانی هەرێم و عێراق و لە رێی پرۆسەی

تواناسازی مرۆیی ژمارەیەك لە مامۆستایان توانیان بڕوانامەی باڵا لە زانکۆ پێشکەوتووەکانی جیهان لە مالیزیا – بەریتانیا – هەنگاریا – چین بەدەستبهێنن کە لە ئەنجامدا وایان کردووە مۆرکێکی ئەکادیمیانە بدەنە سەرجەم کارو چالاکیەکان ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە لەم ڕۆژگارە بە بیرکردنەوەو پلانی ئەکادیمیانە خزمەتگوزارییە ڤێترینەرییەکان ئاراستە دەکرێن، ئەمەش لە چوارچێوەی ئەنجامدانی توێژینەوە زانستیەکان بە مەبەستی دۆزینەوەی چارەسەری گونجاو بۆ کێشەکانی بواری تەندروستی ئاژەڵ و هەروەها تەندروستی گشتی.

توێژینەوە زانستیەکانی کۆلێجی پزیشکیی ڤێترینەری لە ئاستێکی زانستی بەرزدان و بە پێی ئامارەکانی هۆبەی خوێندنی باڵاو کاروباری زانستی و دڵنیایی جۆری لە پرۆسەی ڕیزبەندی نیشتمانی زانکۆکانی هەرێمی کوردستان بۆ ساڵی خوێندنی ٢٠١٨ – ٢٠١٩ز بە ڕێژەی ٧٪ ئەو توێژینەوانەی ئەنجامدراون لە زانکۆی سلێمانی و لە گۆڤارە زانستیە نێو دەوڵەتیەکان کە خاوەن ئیمپاکت فاکتەر (Impact factar) بون لە لایەن مامۆستایانی کۆلێجی پزیشکیی ڤێترینەریەوە بڵاوکراونەتەوە.

مامۆستایانی ئەکادیمی کۆلێجەکانی پزیشکیی ڤێترینەری لە زۆربەی کۆلێجە پزیشکیەکانی مرۆڤ وانە دەڵێنەوە لە کۆلێجەکانی پزیشکیی و پزیشکیی ددان و دەرمانسازی و پەرستاری و زانستە تەندروستیەکان و شیکاری نەخۆشییەکان و بەشەکانی بایۆلۆژی و کیمیا لە کۆلێجەکانی زانست و پەروەردەو کۆلێجەکانی زانستە

ئەندازیاریە کشتوکاڵییەکان و پەیمانگاکان لە چوارچێوەی زانکۆ حکومیەکان و ئەهلیەکان بە شێوەیەکی سەرکەوتوانە کە ساڵ لە دوای ساڵ داواکاریان لەلایەن زانکۆکانەوە فراوانتر دەبێت.

٥. لە ستراتیژیە گرنگەکانی کۆلێجی پزیشکیی ڤێترینەری هەر لە سەرەتای دامەزراندنیەوە توێژی خوێندکاران بون بەوەی ڕاگرایەتی و ئەنجومەنی کۆلێج زۆر بایەخیان دەدا بە لایەنی پەروەردە کردنی خوێندکاران و ئاراستەکردنیان لە چوارچێوەی ڕەفتاری پیشەیی باڵا بە مەبەستی ئەوەی لەدواڕۆژدا پزیشکێکی پەروەردەکراو و شارەزاو ڕەفتارجوان و ڕاستگۆبن، لەبەرئەوە هەر لە سەرەتاوە کۆلێج خوێندکارانی خاوەن ئاستی بەرزو نمرەی بەرزی وەردەگرت ئەمەش لەبەر ئەوەی ئەو خوێندکارانە باشتر لەوانەکان تێدەگەیشتن و لە هۆڵەکانی خوێندندا ئامادەییەکی باشیان هەبوو کە ڕۆژ بە ڕۆژ ئاستیان بەرەو پێشەوە دەڕۆیشت بە شێوەیەك لەم چوار بۆ پێنج ساڵەی دوایی تێکڕای نمرەی وەرگرتنی خوێندکارانی کۆلێجی پزیشکیی ڤێترینەری لە زانکۆی سلێمانی لە نێوان (٨٨ – ٩٦٪)بوو کە لە بەڕێوەبەرایەتی ناوەندی وەرگرتنی سەر بە



وەزارەتی خوێندنی باڵاو توێژینەوەی زانستی وە دیاری دەکرا، بێ گومان ئەمەش بەڵگەی ئەوەیە کە کۆلێجی پزیشکیی ڤێتیرینەری لە پێگەیەکی ئەکادیمی و زانستی ئەوتۆدایە کە بنەماڵەکان بە شێوەیەکی گشتی ئارەزوویانە کە یەکێك لە ئەندامەکانیان لە کۆلێجەکە وەربگیرێت و لە دواڕۆژدا وەك پزیشکێکی ڤێتیرینەری خزمەتی وڵاتەکەی بکات. هەر لە ساڵی یەکەمی خوێندنیانەوە لە قۆناغی یەکەم خوێندکاران لەلایەن مامۆستایانی کۆلێجەوە ئامۆژگاری دەکران و فێردەکران بەوەی ئەوان لەدواڕۆژدا دەبنە ئەندامی خێزانە گەورەکەی پیشەی پزیشکیی ڤێتیرینەری و پێویستە ڕەفتاریان لە ئاستێکی باڵادا بێت چونکە کەسایەتی پیشەیی پزیشکانی ڤێتیرینەری لە قۆناغەکانی خوێندنەوە لە کۆلێج دروستدەبێت و هەروەها لە ڕووی کۆمەلایەتیەوە بە شێوەیەك ئاراستە دەکرێن کە پێویستە پەیوەندیەکی دروستیان لەگەڵ یەکدیدا هەبێت و هەروەها لەگەڵ خوێندکارانی کۆلێجەکانی دیکەی زانکۆ بە مەبەستی بیروڕا گۆڕینەوەو لە ئەنجامدا کاریگەریان لەسەر دروست بکەن و بتوانن زانستیانە بەرگری لە پیشەی پزیشکیی ڤێتیرینەری بکەن، کە ئەمەش بێگومان وایکردووە کە چالاکیەکانیان لە ڕووی چۆنایەتیەوە گۆڕانکاری بەسەردا هاتووە بەوەی لە چوارچێوەی چەند ڕێکخراوێکدا چالاکی جۆراوجۆری بەکەڵك بە ئەنجام بگەیەنن هەروەکو ڕێکخراوی خوێندکارانی پزیشکیی ڤێتیرینەری نێودەوڵەتی ( International Veterinary Students

IVSA Association) کــه چــالاکیەکانیان بــه گشــتی لــه



چوارچــێوەی کوردســتانەوە پەڕیوەتــەوە بــۆ چوارچــێوەیەکی نێودەوڵەتی بەوەی کاردەکەن لە پێناو :

أ. ئاڵوگۆڕکردنی خوێندکاران لەنێوان کۆلێجەکانی پزیشکیی ڤێترینەری لە جیهاندا.

ب. هەوڵدان بۆ بەرزکردنەوەی ئاستی زانستی خوێندکاران.

ج. رێکخســـتنی کــۆنگرەی خوێنـــدکاران ســـالانە دووجـــارو هەرجارەی لە وڵاتێك بە بەشداری نوێنەرانی گشت وڵاتان.

د. بەشـــداریکردن لـــە بەرزکردنـــەوەی ئاســـتی هۆشـــیاریی پزیشکیی ڤێترینەری و بەخێوکردنی ئاژەڵە ماڵییەکان لەنێو خوێندکارانی قۆناغەکانی باخچەی ساوایان و سەرەتایی و ناوەندیەکان و ئامادەییەکان.

٦. لەسەر ئاستی نێودەوڵەتی کۆلێجی پزیشکیی ڤێتەرینەری لە زانکۆکانی سلێمانی و دهۆك وەك دوو دامەزراوەی ئەکادیمی بۆ خوێندنی زانستی پزیشکیی ڤێتەرینەری لەلایەن کۆمەڵەی پزیشکیی ڤێتەرینەری ئەمریکیەوە ( American Veterinary Medical Association) بە فەرمی ناسێنراو ناوی لە لیستی کۆمەڵەکەدا هاتووە، بەمەش دەرچووانی کۆلێجەکان بڕوانامەکەیان بڕواپێکراوەو دەتوانن لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا وەکو پزیشکێکی ڤێتەرینەری کاربکەن لە پسپۆڕی خۆیاندا، هەروەها کۆلێجەکانی پزیشکیی ڤێتەرینەری لە کوردستان بوون بە ئەندام لە ڕێکخراوی (الجمعية العلمية لكليات الطب البيطري العربية) ( Arab scientific association of veterinary medical faculties).

٧. کەناڵەکانی ڕاگەیاندن :



ڕاگەیاندن لەم سەردەمەی ئێستامان لە کوردستان و گشت جیهان ڕۆڵی لەبەرچاو و گرنگی هەیە لە گەیاندن و بڵاوکردنەوەی هەواڵ و زانیاریەکان لەناو گشت چین و توێژەکانی کۆمەڵ و دەتوانین بڵێین هەر لە ڕێی ڕاگەیاندنەکانەوە جیهان هەر وەك گوندێك دێتە بەرچاو. لە بواری پیشەی پزیشکیی ڤێتەرینەری ڕاگەیاندن هۆکارێکی



خێراو پێویستە بۆ بڵاوکردنەوەی هۆشیاریی پزیشکیی ڤێترینەری لەنێو گشت چین و توێژەکانی کۆمەڵ و هەر لەبەر ئەمەشە مامۆستایانی کۆلێجی پزیشکیی ڤێترینەری هەر لە سەرەتاوە ڕۆڵی گرنگیان هەبووە لە بڵاوکردنەوەی زانیارییەکانی پزیشکیی ڤێترینەری لە ڕێگەی کەناڵەکانی ڕاگەیاندنەوە (بیستراو بینراو خوێنراو) و لە ئەنجامدا ئاراستەکردنیان بەشێوەیەکی زانستیانە.




٨. پزیشکانی ڤێترینەری لە سەردەمی پەتای کۆڕۆنا:

لە سەرەتای ساڵی ٢٠٢٠ز پەتای ڤایرەسی کۆڕۆنا وەکو پەتایەکی جیهانی (Pandimic) بە زۆربەی وڵاتانی جیهاندا بڵاوبۆوەو لە ئەنجامدا زیانی ئابوری و تەندروستی و کۆمەڵایەتی و بازرگانی گەورەی گەیاندە گشت وڵاتانی سەر گۆی زەوی.

پزیشکانی ڤێترینەری وەکو توێـژێکی زینـدووی کوردستان ڕۆڵـی لەبەرچـاوو گرنگیـان هـەبووە لـە بڵاوکردنـەوەی زانیـاری دروسـت سـەبارەت بـە ڤایرەسـی کۆڕۆنـاو خەسـڵەتەکانی و چـۆنیەتی سـەرهەڵدانی نەخۆشـیەکەو لـە ئەنجامـدا هۆشـیارکردنەوەی کۆمـەڵ سـەبارەت بـە ترسـناکی نەخۆشـی پـەتای کۆڕۆنـاو چـۆنیەتی خۆپـارێزی و پابەنـدبوون بە ڕێنماییـە تەندروسـتیەکانەوە لـە ڕێـی کۆڕو کۆبوونەوەی بەردەوام و هـەروەها لـەڕێی کەناڵـە جیاجیاکـانی ڕاگەیاندنەکانەوە.

پزیشکانی ڤێترینەری سەرکردایەتی پرۆسەی دەستنیشانکردنی تاقیگـەیی ڤایرەسـی کۆڕۆنایـان کـردووە لـە تاقیگـەکانی دەزگاکـانی تەندروستی هەروەك لە شاری سلێمانی لەلایەن دکتۆر (زانا حمیـد) خـاوەن بڕوانامـەی دکتـۆرا لـە بـواری ڤـایرۆلۆجی بـە تایبـەتی لـە ڤایرەسـی کۆڕۆنا، هـەر لـە سـەرەتای سـەرهەڵدانی پـەتای ڤایرەسـی کۆڕۆنـا هەسـتا بـە دیزاینکردنـی تاقیگەیـەکی تایبـەت بـە دەستنیشـانکردنی ڤایرەسـی کۆڕۆنـای نـوێ (Covid-19) لـە ڕێـی بـەکارهێنانی ئـامێری (Real-time PCR) کـە سـەرکەوتوانە کارەکانیـان ئـەنجام دەداو ئەمـەش وایکـرد کـە ئاسـتی دەستنیشـانکردنی ڤایرەسـەکە لـە تاقیگـەکانی کوردسـتان لـە ئاستێکی زانستی باڵادابێت.

(( پەیکەری ڕێکخستنی کۆلێجی پزیشکیی ڤێتریینەری ))

لە زانکۆی سلێمانی بۆ ساڵی خوێندنی (٢٠١٩ – ٢٠٢٠)

یەکەم : ئەنجومەنی کۆلێجی پزیشکیی ڤێترینەری:

١. پرۆفیسۆر د.فەرەیدون عەبدولستار محمد / ڕاگر ( سەرۆکی ئەنجومەن ).

٢. پرۆفیسۆری یاریدەدەر د.ئەهلە محمد سعید / یاریدەدەری ڕاگر.

٣. پرۆفیسۆر د.بەهجەت تەیفور عەباس / سەرۆکی لقی کلینیك و نەخۆشییەکانی هەناوی .

٤. پرۆفیسۆری یاریدەدەر د.دیاری هیوا عوسمان / سەرۆکی لقی زانستە بنچینەییەکان .

٥. پرۆفیسۆری یاریدەدەر د.سنور محمد امین / سەرۆکی لقی توێکاری و نەخۆشیزانی.

٦. مامۆستا د.عوسمان جەلال عەلی / سەرۆکی لقی نەشتەرگەری و نەخۆشییەکانی زاوورزێ.

٧. مامۆستا د.سادات عبدالله عزیز / سەرۆکی لقی مایکرۆبایۆلۆژی و نوێنەری دەستەی مامۆستایان.



دووەم : لقی زانستە بنچینەییەکان :

١. پرۆفیسۆری یاریدەدەر د.دیاری هیوا عوسمان (سەرۆکی لق)
٢. پرۆفیسۆری یاریدەدەر د.دێرین عمر محمد ڕەمزی (بڕیاردەر)
٣. م.د.سلام حاجی ئیبراهیم (لێپرسراوی هۆبەی خوێندنی باڵا)
٤. پرۆفیسۆری یاریدەدەر د.نادیە عبدالکریم سالّح



٥. م.ی.د.هەرسین محمود ڕەحیم.
٦. م.ی.د.ڕێبین کانبی مجید.
٧. م.ی.د.هاوسەر عوسمان محمد.

سێیەم : لقی توێکاری و نەخۆشیزانی :

١. پرۆفیسۆری یاریدەدەر د.سنور محمد امین ( سەرۆکی لق )
٢. پرۆفیسۆری یاریدەدەر د.ئازاد کەریم سعید ( بڕیاردەر )
٣. پرۆفیسۆری یاریدەدەر د.نەوزاد ڕەشید عبدالرحمن.
٤. پرۆفیسۆری یاریدەدەر د.عەلی حسین حسین.
٥. پرۆفیسۆری یاریدەدەر د.نسرین محی الدین عبدالرحمن.
٦. م.د. شیلان فقی محمد صالح .
٧. م.د. نازەنین عوسمان حەسەن.
٨. م.ی.د.نەورۆز ئەکرەم کاکەڕەش.
٩. م.ی.د. هاڤان داوود سلێمان.
١٠. م.د. إسراء حمید عبدالسادە.
١١. م.د. نزار علی امین.

١٢. م.ی.د.هاوژین جمال محمود.

١٣. م.ی.د. هدیه کریم زۆراب.

١٤. م.ی.د.سازان قادر.



چوارەم : لقی مایکرۆبایۆلۆژی

١. م.د. سادات عبدالله عەزیز ( سەرۆکی لق )

٢. م.د. ڕێبەر نەوزاد محمد. ( بڕیاردەر )

٣. پرۆفیسۆری یاریدەدەر د.نەهلە محمد سعید ( یاریدەدەری ڕاگر )

٤. پرۆفیسۆری یاریدەدەر د. سهی علی حسین .

٥. پرۆفیسۆری یاریدەدەر د. هاژاو عمر محمد مراد.

٦. م.د.إیمان ظاهر عارف.

٧. م.د.شادان حسن عبدالله.

٨. م.د. ئارام أحمد محمد .

٩. م.د.بەهرۆز عباس محمود.

١٠. م.ی.د.زانا مصطفی رشید (لێپرسراوی تۆماری کۆلێج)

١١. م.ی.د.هەوزار فەرهاد محمد (لێپرسراوی هۆبەی ئامارو زانیاری)

١٢. م.د.سیروان سلمان سلیمان.

١٣. م.د.احمد یاسین حمە امین.

١٤. م.دلۆڤان جلال علی.

١٥. م.ی.د.حنان حسن.



**پێنجەم: لقی نەشتەرگەری نەخۆشییەکانی زاووزێ و نۆربون :**

١. م.د.عوسمان جەلال عەلی (سەرۆکی لق)

٢. م.ی.د.دانا عومەر ئیسماعیل (بڕیاردەر)

٣. پرۆفیسۆری یاریدەدەر د.فەرەیدون عەبدولستار محمد (ڕاگری کۆلێج)

٤. پرۆفیسۆری یاریدەدەر د.تاڵب غیدان منەت عەلی.

٥. م.ی.د.سۆزان عەلی محمد.

٦. م.ی.د.ماردین عمر محمد ساڵح.

٧. م.ی.د.هانا حسن مصطفی.

**شەشەم: لقی کلینك و نەخۆشییەکانی هەناوی :**

١. پرۆفیسۆر د.بەهجەت تەیفور عەباس (سەرۆکی لق)

٢. م.ی.د.هەردی فەتاح مارف (بڕیاردەر)

٣. پرۆفیسۆری یاریدەدەر د.ڕزگار ڕەحیم سلێمان .

٤. پرۆفیسۆری یاریدەدەر د.عوسمان جەمال نەسروڵا.

٥. م.ی.د. ڕێبوار باهر أحمد قادر .

٦. م.ی.د. هانا شێرزاد ڕؤوف.

٧. م.ی.د. کوێستان نەجم عەلی.

٨. م.ی.د. باسم عەبدولواحد علی.

٩. م.ی.د. شاخوان لەتیف مەحمود (لێپرسراوی هۆبەی ڕاگەیاندن و وێب سایت)



حەوتەم : هۆبەی خوێندنی باڵاو کاروباری زانستی و دڵنیایی جۆری و فێرکردن :

م.د.سەلام حاجی ئیبراهیم (لێپرسراوی هۆبە)

هەشتەم : نەخۆشخانەی پزیشکیی ڤێترنەری فێرکاری :

م.ی.د.هەردی فەتاح مارف ( بەڕێوەبەری نەخۆشخانە )

نۆیەم : هۆبەی تۆمار ( کاروباری خوێندکاران ) :

م.ی.د. زانا مصطفى ڕەشید (لێپرسراوی هۆبە)

دەیەم : هۆبەی ئامارو بانکی زانیاری :

م.ی.د هەوراز فەرهاد محمد (لێپرسراوی هۆبە)

یازدەیەم : هۆبەی ڕاگەیاندن و وێب سایت :

م.ی.د شاخەوان لەتیف مەحمود (لێپرسراوی هۆبە)

دوازدەیەم : هۆبەی یاسا :

خاتوو نگین نوری أحمد (لێپرسراوی هۆبە)

سیانزدەیەم : هۆبەی کارگێڕی و خۆیی :

خاتوو درەخشان عبدالله عبدالقادر (لێپرسراوی هۆبە)

چواردەیەم : هۆبەی دارایی :

خاتوو گێلاس محمود عبدالرحمن (لێپرسراوی هۆبە)

پازدەیەم : هۆبەی کتێبخانە :

خاتوو چرا جلال قادر (لێپرسراوی هۆبە)

شانزەهەم : هۆبەی گەنجینە :

خاتوو موشتەها محمود حسن

## پەراوێزەکان

١. Kahun Papyrus : papyrus پەپایرەس ڕووەکێکە کە بە شێوەیەکی سروشتی لە دەوروبەری ڕوباری نیل دەڕواو لە قامیش دەچێت و میسریە کۆنەکان هەروەکو کاغەز بەکاریان دەهێنا بۆ تۆمارکردنی زانیاریەکانیان لە بواری پزیشکیی و بوارەکانی دیکەی ژیان.

٢. Ushau : نەخۆشییەکە توشی گاو مانگا دەبوو لە نوسراوەکانی کاهون دا باسکراوە لە سەردەمی میسری کۆنداو بەپێی سەرچاوەکان لێکدراوەتەوە کە مەبەست لە نەخۆشی دەردەخەوە (Trypanosomiasis) .

٣. دکتۆر حەسەن تاج بەخش : لە ساڵی ٢٠٠٨ لە شاری سنە لە کوردستانی ڕۆژهەڵات سمپۆزیۆمێك سازکراوە لە بارەی نەخۆشییەکانی وڵاخەبەرزەوە وە بەڕێز دکتۆر عەباس عەلی عەبدی بەڕێوەبەری گشتی سامانی ئاژەڵ و ڤێترینەری لە هەرێمی کوردستانی عێراقەوە بەشداری تێدا کردووەو لە یەکێك لە دانیشتنەکانی سمپۆزیۆمەکەدا مێژوونوس و مامۆستای بەناوبانگی زانکۆی تەهران پرۆفیسۆر د.حەسەن تاج بەخش ڕوونیکردۆتەوە کە باشترین و جوانترین ئەسپ لە مزۆپۆتامیا دەکەوێتە ناوچەی کەرکوك لە کوردستانی باشور کە بە ئەسپی کەرکوك ناسراوە .

٤. هیپۆکرات Hippocrates : فەیلەسوف و پزیشکی یۆنانی لە مێژوودا بە باوکی زانستی پزیشکیی ناسراوەو مانای هیپۆکرات بریتیە لە بەڕێوەبەری ئەسپەکان (Chief of horses) و Hippopotamus بریتیە لە ئەسپی ڕووبارەکان و Hippology بریتیە لە زانستی ئەسپەکان.

٥. Veterinariusبەو سەربازانە گوتراوە لە لەشکری ئیمپراتۆریەتی ڕۆمان کە ڕۆڵیان هەبووە وەکو پزیشکێکی ڤێترینەری (Veterinary surgeon) .

٦. (equarius medicus) واتە پزیشکیی ئەسپەکان ( Horse doctor) .

٧. أخی حزام محمد بن یعقوب الجبلی : نازناوی (الجبلی) لەو سەردەمەدا بە هەرێمی شاخاویەکان گوتراوە کە دەکەوتە نێوان شارەکانی بەغداو ئەسفەهان، ئەمەش بەڕای من زیاتر ناوچە کوردستانیەکان دەگرێتەوە.

٨. منتفك یان منتفق : میرنشینی منتفك (١٥٣٠ز – ١٩١٨ز) هەموو ئەو هۆزو تیرانە دەگرێتەوە کە لە ناوەڕاست و باشوری عێراقدا هەبوون و میرنشینەکە دەکەوتە ژێر دەسەڵاتی خەلافەتی عوسمانیەکان.

یەکەم / بە زمانی کوردی :


١. ئی. م. دیاکۆنوف ، میدیا، بورهان قانع لە فارسییەوە کردویەتی بە کوردی، چاپی یەکەم، ١٩٧٨.
٢. گیو موکریانی، فەرهەنگی مەهاباد(فەرهەنگێکی قوتابخانەیی کوردی و ئارەوییە)، ٢٠١٢،هەولێر.
٣. عەزیز مورادی، ولاخی یەکسم ( سەرەتایەکی مێژوویی و ڕەگدانەوەی لە کولتوری کوردیدا)، ٢٠١١.
٤. خالید ڕەشید، مێژووی ئەسپ (ئەسپی ڕەسەنی کوردەواری) ، ڕۆژنامەی هەولێر ، ژ:١٢٦٨ لە ٢٠١٢/٢/٢١ .
٥. د.کەمال مەزهەر ئەحمەد، ڕێنیسانس، فؤاد میسری کردوویەتی بە کوردی ، ١٩٨٤ .
٦. د. حمە ڕەشید قەرەداغی ، فەرهەنگی ئازادی ، ٢٠٠٦.
٧. عومەر ئیسماعیل مارف ، دەوڵەتی ماد (٧٠٠ – ٥٥٠ پێش زایین) ، چاپی یەکەم ، ٢٠١٠ سلێمانی.
٨. د.جەلال مەجید شەریف ، پێشنیازی چەند ناوێکی تایبەتمەند بە پیشەی پزیشکیی ڤێترینەری، ١٩٩٨ز.
٩. لیزا یۆنت ، مێژووی پزیشکی، مستەفا غەفور و بەهرە محەمەد لە فارسییەوە وەریانگێڕاوەتە سەر زمانی کوردی.

١٠. د.فەرەیدون عەبدولستار ، هۆشیاریی پزیشکیی ڤێترینەری و ڕەفتاری پیشەیی، چاپی یەکەم ، ٢٠١٢ز ، سلێمانی.
١١. پەیڕەو و پرۆگرامی سەندیکای پزیشکانی ڤێترینەری کوردستان ، ٢٠٠٠ز .
١٢. ڕێبەری کۆلێژی پزیشکیی ڤێترینەری ، زانکۆی سلێمانی (٢٠٠٤ – ٢٠٠٥ز).
١٣. ڕێبەری ٣٤ هەمین خولی دەرچووانی زانکۆی سلێمانی (٢٠١٨ – ٢٠١٩ز) .
١٤. جەمال عەبدول ، دیرۆکی زانکۆی سلێمانی لە ١٤/١١/١٩٩٢ووە ، ٢٠١٨ز ، سلێمانی.
١٥. د.بەهجەت تەیفور عەباس، ئەسپی ڕەسەنی کوردی، گۆڤاری شارباژێڕ ، ژ:٧ وەرزی هاوین ٢٠١٨ز .
١٦. د.عەباس عەلی عەبدی ، بەڕێوەبەری گشتی سامانی ئاژەڵ و ڤێترینەری و سەرۆکی سەندیکای پزیشکانی ڤێترینەری کوردستان/سلێمانی ( پەیوەندی ڕاستەوخۆ).
١٧. گۆڤاری زانکۆ مەگەزین ژمارە (٣ – ٤ ) کانونی یەکەمی ٢٠١٥ ، زانکۆی سلێمانی.
١٨. گۆڤاری زانکۆ مەگەزین ژمارە (٥ – ٦) تەمموزی ٢٠١٦ ، زانکۆی سلێمانی.

١٩. گۆڤاری زانکۆ مەگەزین ژمارە (١١) کانونی دووەمی ٢٠٢٠ز ، زانکۆی سلێمانی.

٢٠. د.عەبدولکەریم حاجی محەمەد عەلی ، نەشتەرگەرییەکانم ، بەرگی یەکەم ، ٢٠٠٩ز ، کەرکوك.

٢١. پرۆفیسۆری یاریدەدەر نەجات ئیسماعیل سایەخان ، بەشی زمانی ئینگلیزی، کۆلێجی پەروەردەی بنەڕەت ، زانکۆی سلێمانی . (پەیوەندی ڕاستەوخۆ)

دووەم / بە زمانی عەرەبی :

١. عبدالرزاق الهلالي ، مُعجُم العراق ( سجل تأريخي سياسي إقتصادي إجتماعي ثقافي يبحث بأيجاز دقيق عن مختلف نواحي الحياة العامة في العراق منذُ العهد العثماني حتى اليوم) ، الجزء الأول ، ١٩٥٣ ، بغداد.

٢. د.حسين عبيد سلمان الجنابي ، صفحات من تأريخ الطب البيطري في العراق، الطبعة الثانية ، ٢٠١٩.

٣. د.حسين عبيد سلمان الجنابي، سطور من تأريخ الطب البيطري في العراق ، الطبعة الأولى ، ٢٠٠٩.

٤. د.علي الوردي، دراسة في طبيعة المجتمع العراقي ، ٢٠١٢.

سێ یەم / بە زمانی ئینگلیزی :

1. Fred J. Born , The early history of the horse doctor , 2011.
2. Kahun papyrus : First writing on veterinary medicine in 1895 Bc in Africa .
3. Joshua J.Mark , A brief history of veterinary Medicine , 2020 .
4. Dr. P. Salvaraj , History of veterinary Medicine in India .

چوارەم/ بە زمانی فارسی :

١. د.حسن تاج بخش ، تأريخ دامپزشكى و پزشكى إيران ، جلد دوم ، دوران إسلامى ، ١٣٧٥ (١٩٩٧ن).

## ژیاننامەی نوسەر :



- لە ساڵی ١٩٦٩ لە شاری کەرکوك لە دایك بووە.
- قۆناغەکانی خوێندنی یەکەم و دووەمی سەرەتایی لە ساڵەکانی ١٩٧٥ – ١٩٧٦ لە وولاتی ئێران تەواو کردووە لە شارۆچکەیەکی نزیك شاری ئەسفەهان.
- قۆناغەکانی خوێندنی سەرەتایی و ناوەندی و ئامادەیی لە شاری سلێمانی تەواو کردووە.
- لە ساڵی ١٩٩١ کۆلێجی پزیشکیی ڤێترینەری لە زانکۆی بەغدا تەواو کردووە.
- لە ١٩٩١/١١/٢ لە بەڕێوەبەرایەتی ڤێترینەری سلێمانی/ هۆبەی هەڵەبجەی تازە دامەزراوەو لە دواییدا گواستراوەتەوە بۆ هۆبەی ڤێترینەری دەربەندیخان و دوای ماوەیەك بۆ نەخۆشخانەی ڤێترینەری سلێمانی لە ناوەندی شار.
- لە ١٩٩٣/١٠/١٣ ڕاژەکەی گواستراوەتەوە بۆ وەزارەتی خوێندنی باڵا بۆ زانکۆی سلێمانی/کۆلێجی پزیشکیی / لقی توێکاری و شانەزانی
- لە ساڵی ١٩٩٥ – ١٩٩٦ ڕاژەکەی گواستراوەتەوە بۆ کۆلێجی پزیشکیی ڤێترینەری.
- لە ساڵی ٢٠٠١ بڕوانامەی ماستەری لە زانستەکانی پزیشکیی ڤێترینەری لە زانکۆی سلێمانی بەدەستهێناوە .
- لە ساڵی ٢٠٠٥ بۆ ماوەی سێ مانگ بەشداری کۆمەڵێك چالاکی کردووە لە بواری ئەنجام دانی توێژینەوەی زانستی و خولی

بەهێزکردن لە زانکۆی هۆهنهایم و دەزگاکانی ڤێترینەری لە شاری شتوتگارت لە وڵاتی ئەڵمانیا.

- لە ساڵی ٢٠٠٦ بوو بە خاوەنی نازناوی زانستی (مامۆستا).
- لە ساڵی ٢٠٠٨ پۆستی یاریدەدەری ڕاگری کۆلێجی پزیشکیی ڤێترینەری وەرگرت.
- لە ساڵی ٢٠٠٨ هەڵبژێرا بە سەرۆکی کۆمەڵەی ئەکادیمیانی کوردستان.
- لە ساڵی ٢٠٠٩ بڕوانامەی دکتۆرای لە زانستەکانی پزیشکیی ڤێترینەری لە زانکۆی سلێمانی بەدەستهێناوە.
- لە ساڵی ٢٠١٠ بووە خاوەنی نازناوی زانستی ( پرۆفیسۆری یاریدەدەر ) .
- لە ساڵی ٢٠١٢ بەشداریکرد لە کۆنگرەی تۆڕی پزیشکانی ڤێترینەری کوردستان لە شاری دهۆك و لە ئەنجامدا هەڵبژێرا بە لێپرسراوی لقی سلێمانی.
- لە ساڵی ٢٠١٥ بەشداریکرد لە کۆنگرەی پزیشکانی ڤێترینەری میزۆپۆتامیا لە شاری دەرسیم لە کوردستانی باکورو سیمینارێکی پێشکەش کرد بە ناونیشانی ( بۆچوونێك لە بارەی زاراوە زانستیەکانی پزیشکیی ڤێترینەری لە زمانی کوردیدا).
- لە بەرواری ٢٠١٥/١٢/١ پۆستی ڕاگری کۆلێجی پزیشکیی ڤێترینەری لە زانکۆی سلێمانی وەرگرتووە.
- لە ساڵی ٢٠١٦ سەردانی وڵاتی بێلا ڕوسیا دەکات لە وەڵامی بانگهێشتنامەی ڕاگری کۆلێجی پزیشکیی ڤێترینەری لە زانکۆی گرۆدنۆ لە شاری گرۆدنۆ و بەشداری کۆمەڵێك چالاکی دەکات.
- لە ساڵی ٢٠١٩ بوو بە خاوەنی نازناوی زانستی ( پرۆفیسۆر ).
- خاوەنی نزیکەی سی توێژینەوەی زانستیە لە بوارەکانی زانستەکانی پزیشکیی ڤێترینەری.

## بەرهەمە چاپکراوەکانی نوسەر :

یەکەم / پەرتوکەکان :

١. دیــاردەی پــەرپوەرین لــە مریشــکی هێلکــە (Force Molting) . کۆمەڵەی پزیشکانی دروستی ئاژەڵ/کوردستان – ١٩٩٩ز .

٢. نەخۆشــی ســەدەی بیســت ئــەنفلۆنزای باڵنــدەو پەیوەنــدی بــە مرۆڤــەوە . کۆمەڵــەی پزیشــکانی دروســتی ئاژەڵ/کوردســتان – ١٩٩٩ز .

٣. فەرهەنگی پزیشکیی ڤێتیرینەری ( ئینگلیزی – عەرەبی – کوردی ) (عەرەبی – کوردی – ئینگلیزی) .

- چاپی یەکەم ، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم ، ٢٠٠٣.
- چاپی دووەم : بەبێ ئاگاداری خاوەنەکەی چاپکراوەتەوە .
- چاپی دووەم : کتێبخانــەی دڵشــاد بــۆ بڵاوکــراوە زانســتیەکان ، ساڵی ٢٠١٢.

٤. پزیشکیی ڤێترینەری ، وەزارەتی رۆشنبیری/بەڕێوەبەرایەتی گشتی چاپ و بڵاوکردنەوە ، بەرگی یەکەم ، ٢٠٠٤ ، سلێمانی.

٥. پزیشکیی ڤێترینەری ، سەنتەری رۆشـنبیری بەهرە ، بەرگی دووەم ، ٢٠٠٩ ، هەولێر.

٦. چــەند بۆچــوونێك لــە دوو تــوێ ی چــەند ووتارێکــدا ، چــاپخانەی شڤان ، ٢٠٠٩ ، سلێمانی.

٧. پزیشکیی ڤێترینەری ، کتێبخانەی دڵشاد بۆ بڵاوکراوە زانستیەکان ، بەرگی سێ یەم ، ٢٠١١ ، سلێمانی.

٨. هۆشیاری پزیشکیی ڤێترینەری و رەفتاری پیشەیی .

- چاپی یەکەم : چاپخانەی یاد/ سلێمانی/٢٠١٢ .
- چاپی دووەم : کۆمەڵەی خوێندکارانی کوردستان/٢٠١٩ .

٩. نەخۆشییەکانی پەلەوەر (Poultry Diseases) ، وەزارەتی خوێندنی باڵاو توێژینەوەی زانستی/زانکۆی سلێمانی ، ٢٠١٤ز.

١٠. نەخۆشییە مرۆژەڵییەکان (Zoonotic Diseases)
- چاپی یەکەم : چاپخانەی ڤاری، ٢٠١٥ ، سلێمانی .
- چاپی دووەم : بەڕێوەبەرایەتی گشتی پەروەردەی سلێمانی ، ٢٠١٩.
١١. زاوزێ و زۆربوون لە ئاژەڵدا (Veterinary Theriogenology) ، چاپخانەی ڤاری،٢٠١٦ز.
١٢. نەخۆشییەکانی ئاژەڵە کاوێژکەرەکان (Diseases of Ruminants)، چاپخانەی ڤاری، ٢٠١٨ز.
١٣. ڕێنماییەکان بۆ خۆپاراستن لە کۆرۆنای تازە، کۆلێجی پزیشکیی ڤێترینەری، زانکۆی سلێمانی، ٢٠٢٠.

دووەم / گۆڤارو ڕۆژنامەکان :

لەدوای ساڵی ١٩٩١ز-ەوە لە زۆر گۆڤارو ڕۆژنامەکان بابەتی بڵاوکردۆتەوە، گۆڤارەکانی وەکو ( بژوێن - پەیامی ڕاستی - ئەکادیمی - سەربەخۆیی - بانەڕۆژ - بابان - چەرمۆ - زانستی سەردەم - بایۆلۆجی - خۆپارێزی - سلێمانی - پێشمەرگە - ئێشك - خود - شاهۆ - پزیشکی- پزیشکی نوێ - رازیانە - زانکۆ مەگەزین - کەرکوك - هەتوان - ئۆزۆن - نواڵەی نوێ - ڤێترینەری - شارباژێڕ - ڕابەر - پزیشکیی ڤێترینەری کەرکوك - خاك).

لە ڕۆژنامەکانی وەکو ( کوردستانی نوێ - ئاسۆ - التآخي - زانکۆ - کەرکوکی ئەمڕۆ - الأتحاد - هەرێمی کوردستان - کەرکوك - ڕۆژانەی سلێمانی - گۆڕان - زەنگ - بەرگری - دەروازەی ئایندە - پزیشکیی ڤێترینەری - ژیار - پاشکۆی سلێمانی نوێ ).